

گۆڤاری
# كۆمپیوتەر

ژمارە
٣
(ئاب)ی ٢٠٠٥

گۆڤارێكی مانگانەی تایبەتە بەبواری كۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەكات






- بینینی نەخشەی هەموو جیهان *Google Earth*
- خێرا كردنی پەیوەندی انترنیت بۆ *(115 Kb)* لەچركەیەكدا.
- دانانی ووشەی نهێنی بۆ فایلەكان .
- جولاندنی ئاراستەی ماوس بە كیبۆرد .
- دامەزراندنی كیبۆردی كوردی .

هەولێر ـ ٢٠٠٥

ژمارە ( 3 )
ساڵی 2005

# گۆڤاری کۆمپیوتەر

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت . وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات

**خاوەنی ئیمتیاز**
وەزیری ڕۆشنبیری
سامی شۆڕش

**سەرنووسەر**
ئاراز مەولود ڕەشید

**جێگری سەرنووسەر**
فاخر مەحمود میرزا

**بەڕێوبەری هونەری**
یاسین عاصم

**دەستەی نووسەران**
ڕێناز ئەردەلان بەکر
ڕێبوار نوری سەعید
شاخەوان عمر حەسەن

**دیزاینی بەرگ**
عەزیز ئەسعەد

سەرپەرشتی چاپ
ئەهرۆ محمود

## تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت

**ناونیشان**
هەرێمی کوردستانی عێراق / هەولێر . دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری . شەقامی شەست مەتری نزیك هۆڵی زەرد
بۆ هەر پێشنیار و تێبینی و سەرنجێك دەربارەی گۆڤارەکە یان ناردنی بابەتێك . پەیوەندی بکەن
بەم ناونیشانە : دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری . بەڕیوبەرایەتی کۆمپیوتەر . یان بە ژمارە تەلەفۆنی
2232721 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی
Email : computer_magazine_2005@yahoo.com
Email : aras_co_center@yahoo.com



**ئاگاداری**
ئەو بابەتانەی کە لە گۆڤارەکەمان بڵاو دەکرێتەوە شێوەی نووسین و باسکردنیان بۆ خاوەنەکانیان دەگەڕێتەوە هەروەها ئەو بەڕێزانەی کە بابەتی وەرگێران ئەنێرن یا ئاماژە بە سەرچاوەکەی بکەن بە پێچەوانەوە ئێمە بەرپرسیار نین لە هیچ لێپرسینەوەیەك.

چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە/ هەولێر



# سوپاس و پێزانین

بە ناوی خۆم و بنەماڵەکەمانەوە سوپاس و پێزانینی خۆمان ئاراستەی هەموو ئەو بەڕێزانە دەکەین کە بەشداریان کرد لە پرسەی خوالێخۆشبوو ( اسماعیل مەولود ڕەشید) کە دەکاتە برای سەرنووسەر خودای گەورە پاداشتی بەخێری هەموو لایەك بداتەوە .

## بەرنامە 3





## ڕیپۆرتاژ 40



## ئەنتەرنێت 43





## زانیاری 26



## هەمەڕەنگ 50





# دەرهێنانی هەڵسەنگاندن (تقدیر) لە بەرنامەی ئێکسڵ دا

## زانکۆ ئەسعد تەها

بەرنامەی ئێکسڵ یەکێکە لە بەرنامە پراکتیکیەکانی ئۆفیس کە بەکاردێت بۆ زۆر کاری گرنگ وەک دروست کردنی خشتەی تایبەت بە زانیاریەکانی نمرە و مووچە و ئەنجام دانی چەندین کاری ژمێریاری بەسەر زانیاریەکان وەک دۆزینەوەی (کۆنمرە،تێکرا،بچووکترن ژمارەو، گەورەترین ژمارە ...هتد) کە هەریەک لەمانە بە نەخشەی (FUNCTION) تایبەت ئەنجام دەدرێت کە لە بەرنامەی ئێکسل دا هەیە،لێرەدا باس لە نەخشەی (VLOOKUP) دەکەین کە بەبەکارهێنانی ئەم نەخشەیە دەتوانین هەستین بە دۆزینەوە هەڵسەنگاندن (تقدیر) بۆ نمرەکان بۆ نموونە تۆ کۆمەڵێک ناو لەگەڵ ژمارەت هەیە دەتەوێت ئەو کەسی کە نمرە لە نێوان (٩٠) تاوەکو (١٠٠)دایە لەخانەی تەنیشتی بەرامبەر نمرەکەی بنووسرێت (نایاب) یاخود نمرەکەی لە نێوان (٧٠) تاوەکو (٨٠) لە خانەی تەنیشتی بنووسرێت (باشە) ئیتر بەم شێوەیە،لەخوارەوە هەنگاو بەهەنگاو روونی دەکەینەوە:

١. کلیک لەسەر (START) دەکەین پاشان دەچینە سەر (PROGRAMS) لەوێشەوە کلیک لەسەر (MICROSOFT EXCEL) دەکەین، بروانە وێنەی(١).

٢. پاش چوونە ناو پرۆگرامی ئێکسل




وێنەی (١)




وێنەی (٢)




وێنەی (٣)

ئەوا کلیک لەسەر (SHEET RIGHT-TO-LEFT) دەکەین ئەگەر پرۆگرامی ئێکسل ئینگلیزی بێ چوونکە زانیاریەکان بە کوردی دەنووسینەوە.

بروانە وێنەی (٢).

٣. یەکەم خانەی ستونی (A) ناو دەنێین (ناو) پاشان کۆمەڵێک ناو لە ژێری دەنووسین وە یەکەم خانەی ستونی (B) ناودەنێین (نمرە) وە لەژێری کۆمەڵێک ژمارە لەنێوان (٠ تاکو ١٠٠) وەک نمرەی کەسەکان دەنووسین،وە یەکەم خانەی ستونی (C) تەنها ناو دەنێین (هەڵسەنگاند) هەروەک لە وێنەی (٣) دا رونکراوەتەوە.

٤. پاشان یەکەم خانەی ستونی (E) ناو دەنێین (نمرەکان) وە یەکەم خانەی ستونی (F) ناو دەنێین (ئاستەکان) ئەم ژمارانەی خوارەوە بەرامبەر ئاستەکان وەک ئەم خشتەی خوارەوە لە ژێر هەردوو ستونەکە دەنووسین، سەیری خشتەکە بکەوە پاشان بروانە وێنەی (٤).

**خشتەی نمرەکان و ئاستەکان**

| | |
|---|---|
| 0 | کەوتوو |
| 50 | پەسند |
| 60 | ناوەند |
| 70 | باشە |
| 80 | زۆرباشە |
| 90 | نایاب |

٥. کلیک لە سەر خانەی ژێر ستونی (هەڵسەنگاند) واتە خانەی (C2) دەکەین.




وێنەی (٤)

Insert Function
Search for a function:
vlookup
Go
Or select a category: All
Select a function:
ABS
ACOS
ACOSH
ADDRESS
AND
AREAS
ASIN
ABS(number)
Returns the absolute value of a number, a number without its sign.
Help on this function
OK
Cancel

وێنەی (٥).

٦. لەلیستی (INSERT) دا کلیک لەسەر (FUNCTION) دەکەین وە لەشوێنی (SEARCH FOR FUNCTION) دەنووسین (VLOOKUP) پاشان کلیک لەسەر (GO) ئینجا دواتر لەسەر(OK) دەکەین بڕوانە وێنەی (٥).

٧. لە بۆکسی نەخشەی (VLOOKUP) دا زانیاریەکان بەم شێوەیە دەنووسین.

–لەشوێنی (LOOKUP_VALUE) دا ناوی خانەی نمرەی یەکەم کەس دەنووسین بەگوێرەی ئەم نموونەیەی ئێمە دەکات (B2).

– لە (TABLE_ARRAY) دا بواری (RANGE) خشتەی (نمرەکان و ئاستەکان) دەنووسین پاشان هێمای ($) دادەنێین لەنێوانیان دا بە گوێرەی ئەونموونەی ئێمە بواری خشتەی (نمرەکان و ئاستەکان) کە لە (E2) دەستپێدەکات تا (E7) لەگەڵ هەمان خانەکانی (F) بۆیە بوارەکە دەکات (E2:F7) لەگەڵ دانانی هێمای ($) واتە لەناو (TABLE_ARRAY) دا دەنووسین ($E$2:$F$7).

– لە (COL_INDEX_NUM) دا تەنها ژمارە (٢) دەنووسین، پاشان کلیک لەسەر (OK) دەکەین بڕوانە وێنەی (٦).

٨. پاش دەرهێنانی ئەنجامی هەڵسەنگاندنی خانەی یەکەم ئەوا ماوسەکە دەبەینە سەر لێواری ژێرەوەی لای دەستە چەپ کاتێک تیرەی ماوس شێوەی (+) وەردەگرێت رای دەکێشین بۆ خوارەوە بۆ دەرهێنانی ئەنجامی هەڵسەنگاندنی خانەکانی تر، بڕوانە ئەنجامی کۆتایی.

Function Arguments
VLOOKUP
Lookup_value B2 = 85
Table_array $E$2:$F$7 = {0,"ئابای",90;"زۆرباشە"
Col_index_num 2 = 2
Range_lookup =
= "زۆرباشە"
Looks for a value in the leftmost column of a table, and then returns a value in the same row from a column you specify. By default, the table must be sorted in an ascending order.
Table_array is a table of text, numbers, or logical values, in which data is retrieved. Table_array can be a reference to a range or a range name.
Formula result = زۆرباشە
Help on this function
OK
Cancel

وێنەی (٦)

Microsoft Excel - Book-نش

| | A | B | C | D | E | F |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | ناو | نمرە | هەڵسەنگاندن | | نمرەکان | ئاستەکان |
| 2 | زانکۆ | 85 | زۆرباشە | | 0 | کەوتوو |
| 3 | واحد | 95 | نایاب | | 50 | پەسند |
| 4 | دانا | 50 | پەسند | | 60 | ناوەند |
| 5 | دەشتی | 66 | ناوەند | | 70 | باشە |
| 6 | کاوە | 79 | باشە | | 80 | زۆرباشە |
| 7 | نەرژی | 59 | پەسند | | 90 | نایاب |
| 8 | ناراز | 89 | زۆرباشە | | | |
| 9 | توانا | 45 | کەوتوو | | | |

وێنەی (٧)

# بەرنامەی Encrypt

ئامادە کردنی:
فەیسەڵ مەعروف



وینەی ژمارە-١



وینەی ژمارە-٢



وینەی ژمارە-٣

بەرنامەی (ENCRYPT) تایبەتە بە دانانی ووشەی نهێنی (PASS WORD) بو ئەو (فولدەر، فایل) انەی کە دەمانەویت ووشەی نهێنی بو دابنیین، پاش دابەزاندنی بەرنامەیENCRYPT بو سەر سیستەمەکەمان، ئەوا کلیکی راستە لە سەر (فولدەر، فایل) کە دەکەین کە دەمانەویت ووشەی نهێنی بو دابنیین و دواترENCRYPT هەلدەبژیرین (وینەی ١).

کاتی بو یەکەم جار بەرنامەکە بە کار دەهینین ئەوا پیویستە ووشەی نهێنی



وینەی ژمارە ٤

وینەی ژمارە-٥

تایبەت بە خۆمان کە هەمیشە بە کاری دەهێنین لەم پەنجەرەیەی کەبۆمان دەکریتەوە تۆمار بکەین (وینەی ٢)·

پاشان ووشەی نهێنی تایبەت بۆ کردنەوەی فۆڵدەر یان فایلەکە لەم پەنجەرەیەدا تۆمار دەکەین (وینەی ٣)·

دوای نووسینی ووشەی نهێنیەکە ئەوا شێوەی فایلەکە بەم شێوەیەی لی دیت کە لە (وینەی ٤) دا دیارە کە شێوەی کلیل و قوفلیک وەردەگریت·

بۆ کردنەوەی ئەو فایلەی کە ووشەی نهێنیمان داوەتی ئەوا کلیکی لای راست لەسەر فایلەکە دەکەین و دواترلە سەر DECRYPT کلیک دەکەین (وینەی ٥)·

دوای ئەوە ووشەی نهێنی یەکە دەنووسین و فایلەکە دەکریتەوە. (وینەی ٦)




وینەی ژمارە ٦

# بەرنامەی دامەزراندن
# (setup factory version 6.0)

ئامادەکردنی: کامران خۆشناو
kameran7605@yahoo.com

بەڕێزان بەیەکەوە باسی یەکێک لەبەرنامەکانی دامەزراندن (SETUP) دەکەین، کەزۆر بەکاردەهێنرێت ئەویش بەهۆی ئاسان بەکارهێنان و دەست گرتن بەسەر هەموو پێکهاتەکانی دامەزراندن، ئەویش بەرنامەی (SETUP FACTORY VERSION 5&6) ە .

سەرەتا دەبێت بەرنامەکە لەسەر کۆمپیوتەرەکەت دابمەزرێنیت SETUP بکەیت دوای دامەزراندنی بەرنامەکە لە سەر سیستەمەکە دەست دەکەین بە کردنەوەی بەرنامەکە دەبینین ئەم شێوەیەت بۆ بەدیار دەکەوێت لەسەر ڕووبەری شاشەکە بڕوانە (وێنەی ژمارە ١)، ئینجا بەرنامەکە بکەرەوە و دواتر پەنجەرەیەکی ترت بۆ




وێنەی ژمارە-١

دەکرێتەوە لەو پەنجەرەیەدا خانەی USE THE PROJECT WIZARD دیاری بکەوە (CREATE A NEW PROJECT هەڵبژێرە، دوایی NEXT بکە پەنجەرەیەکی ترت بۆ دەردەکەوێت کە چەند بۆشاییەکی تیدایە بڕوانە (وێنەی ژمارە ٢) ئنجا دەست دەکەین بە پڕکردنەوەی بۆشاییەکان وەکو لەوێنەکەدا دیاری کراوە، دواتر کلیک لەسەر NEXT دەکەین ئنجا بەرنامەکە دەپرسی لە شوینی مەلەفەکان و دەست دەکەین بە هێنانی مەلەفەکان، پاشان NEXT دەکەین پەنجەرەیەکی ترمان بو دەردەکەویت کە چەند چوار گوشەیەکی تیدایە (وێنەی ژمارە ٣)، خانەی یەکەم دیاری بکە بو دانانی مەلەفی (UNINSTALL) واتە لابردنی بەرنامەکە، و خانەی کوتایی بو دانانی مەلەفی کارپیکردنی سەردکی

Setup Factory Project Wizard

General Information

Fill in the fields below and click Next to continue.

What is your company name?
کامران بو سوفتویر — ناوی کۆمپانیاکەت لێرە بنوسە

What is your product's name or title?
بەرنامەی ریبازی کومپیوتر — ناوی بەرنامەکەت لێرە بنوسە

What is your product's version?
1.0 — ژمارەی ڤێرشنەکەی لێرە بنوسە

What is your product's marketing tagline?
Marketing hype here!

What is your product's information URL?
http://www.CompanyXDomain.com

< Back | Next > | Cancel

وێنەی ژمارە-٢




وێنەی ژمارە-٣

(VISUAL BASIC)، و دیاری کردنی ڤێرژنەکەی لە(SELECTRUNTIMEMODULES) پاشان OK و لەدواییدا FINISH بکە، دەبینین دەگەڕێتەوە شاشەی سەرەکی بەرنامەکە و مەلەفەکان زیاد کراون، لە لیستی لای چەپی بەرنامەکە چەند دوگمەیەک هەیە (.GENERAL DESIGN، SCREENS، ACTION، PACKAGES، (RUNTIME SUPPORT، UNINSTALL ئەمانیش هەمووی بۆ کاری نەخشەسازی کرداری دامەزراندنەکەن،

لە (GENERAL DESIGN) وەکو دەبینین دەتوانین چەند کردارێک بکەین (وێنەی ژمارە ٤)، لە PRODUCT INFO دەتوانین گۆرانکاری بکەین لەو خانانەی پڕمان کردەوە لە شاشەی WIZARD، لە SETTING دەتوانین ناوی بەرنامەکە لە ڕیزەوی PROGRAM FILES و TASK BAR دیاری بکەین و دروست کردنی فۆڵدەرێکی تازە لەکاتی دابەزاندن، و لە SERIAL NUMBER دەتوانین شێوەیەکی ژمارەیی بکەین بە ژمارەی نهێنی بۆ بەردەوام بوون لە کاری دامەزراندن لەلای بەکارهێنەر، و لە (SCREENS) دەتوانین دەست بەسەر شێوەی ئەو شاشانەدا بگرین کە بەدیار دەکەون لەکاتی دابەزاندنی بەرنامەکە وەکو شاشەی:

LICENSE AGREEMENT واتا ڕازی بوون بە دانانی بەرنامەکە، و لە (ACTION) دەتوانین وا بکەین کە بەرنامەی دامەزراندن(SETUP) شۆرتکەتێک بۆ بەرنامەکە لەسەر ڕووبەری شاشە دروست بکات.

و دەتوانین هەڵسین بە هێنانی مەلەفی تر بۆ بەرنامەکە ئەویش بەوەی کلیکی ڕاستی ماوس دەکەین لەسەر بەرنامەکە و ADD FILES هەڵدەبژێرین یاخود داگرتنی دوگمەی INSERT ی کیبۆرد.

پاش جێ بەجێ کردنی ئەم کردارانە دوگمەی F6 دادەگرین ئەم پەنجەرەیەمان بۆ بەدیار دەکەوێت (وێنەی ژمارە ٥)، لە OUTPUT FOLDER هەڵسە بە گۆڕینی شوێنی پاراستنی مەلەفی دامەزراندنەکە، و لە SETUP FILE NAME دەتوانین هەڵسین بە نوسینی ناوی مەلەفی دامەزراندن، لە کۆتایی هەموو کردارەکان F7 دادەگرین بۆ دەست کردن بە کرداری COMPILING و دروست کردنی بەرنامەی دامەزراندن (SETUP).




وێنەی ژمارە-٤




وێنەی ژمارە-٥



وێنه‌ی (١)






وێنه‌ی (٢)

## بۆ دروست كردنی بنكه‌ی زانیاری به‌رنامه‌ی ئه‌كسێس بكه‌ره‌وه‌و ئه‌م هه‌نگاوانه‌ بگره‌ به‌ر:

١- نیشانه‌ی ماوس بگوازه‌وه‌ سه‌ر لیستی FILE و یه‌ك كلیكی له‌سه‌ر بكه‌، ئینجا كوماندی NEW هه‌لبژێره‌و به‌دوگمه‌ی لای چه‌پ یه‌ك كلیكی له‌سه‌ری بكه‌، وێنه‌ی (١).

٢- له‌لای راستی به‌رنامه‌ لاكێشی NEW FILE ده‌رده‌كه‌وێت كه‌ كومه‌لێ كوماندی تایبه‌ت به‌ دروست كردنی بنكه‌ی زانیاری نوێت پیشان ده‌دات، وێنه‌ی (٢).

BLANK DATABASE: بۆ دروستكردنی بنكه‌یه‌كی زانیاری نوێ و به‌تال.

BLANK DATA ACCESS PAGE: بۆ دروستكردنی لاپه‌ره‌یه‌كی گه‌یشتن به‌ داتا كه‌ له‌ رێگای INTERNET EXPLORER به‌كاردێت.

PROJECT USING EXISTING DATA: دروست كردنی پرۆژه‌یه‌ك له‌سه‌ر داتایه‌كی دیاری كراو یان بنكه‌یه‌كی زانیاری كه‌ پیشووتر دروست كراوه‌.

PROJECT USING NEW DATA: دروست كردنی پرۆژه‌یه‌ك بۆ بنكه‌یه‌كی زانیاری نوێ.

FROM EXISTING FILE: دروست كردنی بنكه‌یه‌كی زانیاری نوێ له‌سه‌ر فایلێكی تر كه‌ پیشتر دروست كراوه‌.

٣- بۆ دروست كردنی فایلی بنكه‌ی زانیاری نوێ: یه‌ك كلیك بكه‌ له‌ سه‌رBLANK DATABASE دوای ئه‌وه‌ خانه‌ی بنكه‌ی زانیاری نوێ ده‌رده‌كه‌وێت، وێنه‌ی (٣).

له‌ شوێنی FILE NAME ناوێك بۆ فایلی بنكه‌ی زانیاری بنووسه‌ (بۆ نموونه‌: BOOKS)

٤- ئنجا یه‌ك كلیك بكه‌ له‌سه‌ر دوگمه‌ی CREATE.
دوای ئه‌وه‌، به‌رنامه‌ی ئه‌كسێس بنكه‌یه‌كی زانیاری نوێ و به‌تال ئه‌كاته‌وه‌و وه‌ك له‌ وێنه‌ی ژماره‌ (٤) ده‌رده‌كه‌وی.



وێنه‌ی (٣)

وێنەی (٤)




وێنەی (٥)

وێنەی (٦)

## چوارچێوەی بنکەی زانیاری لەم بەشانەی خوارەوە پێک دێت:

١- شـریتی ناونیشانی بنکەی زانیاری TITLE BAR، کـە نـاوی فایلەکـەی تیادا دەردەکەوێت، وێنەی (٥).

٢-شریتی ئامرازەکانی بنکەی زانیاری TOOLS BAR، کـە کۆماندەکانـی OPEN، DESIGN، NEW ی تیدایە، وێنەی (٦).

٣- پانـە شــــریتی تەنـەکان (OBJECTS PANEL) کـە ناوی تەنەکانی بنکەی زانیاری لە خۆی دەگریت، وەک: TABLE، QUERY، FORMS، DATA ACCESS PAGE، MACRO، REPORTS، MODULES...




وێنەی (٧)

٤- شوێنی هەڵگرتنی پێکهاتەکانی هەر تەنێک لە بەشەکانی بنکەی زانیاری، وێنەی (٧).

## داخستنی بنکەی زانیاری:

بۆ داخستنی بنکەی زانیاری کراوە، یەک لەم ڕێگایانە بگرە بەر:

١- نیشانەی ماوس بگوازەوە بۆ سەر لیستی FILE و یەک کلیکی لەسەر بکە، ئنجا یەک کلیک بکە لەسەرکۆماندی CLOSE ، وێنەی (٨).

٢- یەک کلیک لەسەر دوگمەی داخستنی X لە چوارچێوەی بنکەی زانیاریەکە بکە.




وێنەی (٨)

## کردنەوەی بنکەی زانیاری:

بۆ کردنەوەی بنکەیەکی زانیاری کە پێشتر کۆگەکرابوو یەک لەم ڕێگایانە بەکاربێنە:

### یەکەم:

١-لیستی FILE بکەوە.

٢- کۆماندی OPEN هەڵبژێرە،

٣-خانەیەک دێتە سەر شاشە کە ناوی فایلەکانی تێدایە،

٤- یەک کلیک بکە لەسەر ناوی فایلی مەبەست ئنجا کلیک بکە لەسەر دوگمە OPEN ، وێنەی (٩).

### دووەم:

ئەگەر ناوی فایلەکە لە خوارەوەی لیستی فایل دەرکەوت، تەنها یەک کلیک لەسەر ناوی فایلی مەبەست بکە، یەکسەر بنکەی زانیاریەکەت بۆ دەکاتەوە.

### سێیەم:

ئەگەر ناوی فایلی مەبەست لە خانەی لای ڕاست، لە ژێر ناونیشانی OPEN هەبوو، ئەوا یەک کلیک لەسەر ناوی فایلی مەبەست بکە، دوای ئەود بنکەی زانیاریەکەت بو دەکریتەوە.




وێنەی (٩)

# بەکارهێنانی فلتەرەکان لە فۆتۆشۆپ

ئامادەکردنی: عەزیز ئەسعەد


وێنەی (١)


وێنەی (٢)

فلتەرەکان لەفۆتۆشۆپ بریتین لەچەند فەرمانێک کە بە هۆیانەوە دەتوانین کاریگەری لەسەر وێنەو نووسینەکان (TEXT) ئەنجام بدەین . ئەم فلتەرانەش ژمارەیان زۆرەو باس کردنیان لێرە کاتێکی زۆری دەوێ . بەلام باشترین ڕێگە بۆ فێربوون و زانینی کاریگەری فلتەرەکان،بەکارهێنان وتاقی کردنەوەیانە یەک بەدوای یەک لەسەر وێنە . بەمەش دتوانین دەرئەنجامی کاری هەریەکەیان بزانین .

بۆ نموونە گۆرانی وێنەی ژمارە (١) بۆ وێنەی ژمارە (٢) بەبەکارهێنانی فلتەری (GLASS) دەبێت . بۆ ئەمەش ئەم هەنگاوانە دەنێین:

FILTER ⟶ DISTORT ⟶ GLASS،
وێنەی ژمارە (٣).

ئەم فلتەرانە لەگەل دابەزاندنی بەرنامەی فوتوشۆپ دادەبەزن .

بەلام کۆمەڵەیەکی زۆری تر لەفلتەر هەن کە لەناو بەرنامەکەدا نین و پێویستیان بەدابەزاندنی تایبەت هەیە لەناو بەرنامەکە . گرنگترین ئەم فلتەرانە فلتەری (EYECANDY و KPT و ANDROMEDA ) و دەیان فلتەری ترە .

لەفلتەرە هەرە گرنگەکان کە کاریگەریەکی زۆر جوان دەبەخشن بەوێنە بەتایبەتی کاریگەریان هەیە لەسەر نووسین (TEXT) فلتەری (EYE CANDY.4000 )ە .

دابەزاندنی ئەم فلتەرەش بەم شێوەی خوارەوە دەبێ .

سەرەتا ئێمە دەبێ فلتەری (EYE CANDY.4000)مان هەبێ لەسەر سی دی، ئەمەش بەشێوەیەکی بلاو لەبازار هەیەو دەست دەکەوێت.

دوای کردنەوەی سی دیەکە فۆلدەری (EYE CANDY.4000) دەکەینەوە کە دەکەوێتە ناو فۆلدەرێکی تری تایبەت بە (ADOBE PLUGINS)، کلیک لەسەر



وێنەی (٣)

ئایکۆنـەی (SET UP) دەکەیـن و ئـەم بۆکسـەی خوارەوەمـان بـۆ دەکرێتەوە وەک لەوێنـەی ژمارە (٤) . یەک بەدوای یەک هەنگاوەکانـی (SET UP)ەکە تەواو دەکەیـن بـە بـەکار هێنانـی (S.N) ی (DIJOMMHCPEOM) وێنـەی ژمارە (٥)، بەڵام کاتێک دەگەینـە ئەو هەنگاوەی کە دەمانەوێ شوێنی فلتەرەکە دیاری بکەین بەم شێوەیە هەنگاوەکان تەواو دەکەین: C/PROGRAM FILES.ADOBE.ADOBE) (PHOTOSHOP.PLUGINS وەک لەوێنەی ژمـارە (٦) چونکـە ئەگـەر (فلتەرەکـە) نەخەینـە نـاو (فۆڵـدەری) (PLUGINS) ەوە ئـەوا لەنـاو بەرنامـەی فۆتۆشـۆپ کارناکات.

دوای ئـەوە بەرنامـەی فۆتۆشـۆپ دەکەینـەوە و لەلیسـتی فلتـەر دەبینیـن فلتـەری(EYE CANDY.4000) دابەزیـوە. بەهەمـان شـێوە کاریگەری بەشـەکانی فلتەرەکە لەسـەر نووسین یان وێنەیەک بەکاردێنیـن و سـەیری ئەنجامەکـەی دەکەین.




وێنەی (٤)




وێنەی (٦)




وێنەی (٥)

# بەرنامەی (Wave Lap) ویڤلاپ




وێنەی (١)




وێنەی (٢)

## ئا: لاڤا هەولێری

بیگومان هەموومان پێویستمان بە تۆمارکردنی دەنگ دەبێت بۆناو کۆمپیوتەر ئینجا چ لەڕێگای کاسێت بێت یاخود لەڕێگای مایکرۆفۆن بێت WAVELAP لەم کاتە پێویستیەکانمان پڕدەکاتەوە هەروەها زۆربەی زاناکان لەبواری کۆمپیوتەر ئەم بەرنامەیەمان بەپەسەند داناوە کەوا زۆر بەسادەیی دەنگ تۆماردەکات و بێ ئەوەی هیچ هەوایەک یان شەپۆلی کارەبایی لەگەڵ دەنگەکە تۆمار بکات، وێنەی (١).

چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم بەرنامەیە:

١- هێمای ریکۆرد (RECORD) ئەمەیان زۆر گرنکە لەڕێگای ئەمەوە دەتوانین هەمووکارەکانمان ئەنجام بدەین بەم شێوەیە، وێنەی (٢).

هێمای ریکۆرد کلیک دەکەین ئەم لیستە دەکەوێتە بەرچاو بەم شێوەیە، وێنەی (٣).

ئینجا چەند شتێک بەدیار ددکەویت




وێنەی (٣)

وەک MONITOR -۱ پێش ئەوەی هێمای ریکۆرد دووبارە لێبدەین دەبێ بوشایی کلیک MONITOR کلیک دەکەین ئینجا ریکۆرد کلیک دەکەین بەم شێوەیە، وێنەی (٤)

٢- لەکاتی تەواوبوونی ریکۆرد هێمای STOP ستۆپ کلیک دەکەین واتا راگرتن بەم شێوەیە، وێنەی (٥).

ئینجا بۆ خەزن کردنی کارەکانمان دێینە FILE لەوێوە SAVEAS کلیک دەکەینە سەری و ئەم لیستە دەکەوێتە بەرچاو، وێنەی (٦).

ئینجا SAVE کلیک دەکەین بۆهەلگرتنی دەنگەکە.




وێنەی (٤)



وێنەی (٦)



وێنەی (٥)

هەر وەک لە ژمارەکانی پێشووتری ئەم گۆڤارە کۆمەڵێک سایتی جۆراو جۆرمان بۆتان ئامادە کردبوو لەم ژمارەیەشدا کۆمەڵێک سایت و ماڵپەری بەهێز بۆ فێرکردنی سیستەم و بەرنامەکانی تایبەت بە ئامێری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت بە زمانی عەرەبی مان بۆتان ئامادە کردووە تا ئێوەی بەرێز سوودیان لێ وەربگرن بۆ فێربوونی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت.

**کۆمەڵێک سایتی فێرکاری**

**بەرنامەکانی پاراستنی ئامێری کۆمپیوتەر (الحماية)**

http://mooj3.jeeran.com/01hmaeh.htm

**بەرنامەکانی پۆستە و گەیاندن (البريد والأتصالات)**

http://mooj3.jeeran.com/02bareedatsalat.htm

**بەرنامەکانی ئەنتەرنێت**

http://mooj3.jeeran.com/04internet.htm

# بەرنامەی fix-it utilities کرداری گەڕانەوەی فایلە سڕاوەکانی ناو کۆمپیوتەر

ئا: باوکی ئاشنا

دوای ئەوەی لە زنجیرەی یەکەمدا باسی کرداری پاکردنەوەی کۆمپیوتەرمان کرد لە ڕێگای ئەم بەرنامەیەوە بۆ ئەم جارەیان کرداری گەڕانەوەی فایلە ڕەشکراوەکان دەکەین کە زۆرجار بە هەڵە ڕەش دەکرینەوە یان لە ناو دەبرین بۆیە یەکێکی تر لە خزمەت گوزاریەکانی ئەم بەرنامەیە گەڕانەوەی ئەم فایلانەیە بۆ ناو کۆمپیوتەرەکەت وەکو باسمان کرد دەبێت ئەم بەرنامەیە لە ناو کومپیوتەرەکەت هەبێت یان ئەگەر نەبوو دایمەزرێنیتە ناو کۆمپیوتەرەکەت .

بو هەڵبژاردنی بەشی گەڕانەوەی فایلەکان لە فەرمانی دەست پیکردن (START ) کلیک دەکەین و دەچینە سەر هەڵبژاردەی بەرنامەکان و (PROGRAMS) لەوی دەچینە سەر بەشی بەرنامەکە UTILITIESکە لیستیکی لەگەڵە دوایی



وێنەی (١)

کلیک لەسەر EASY RECOVERY دەکەین بڕوانە وێنەی ژمارە (١)، ئینجا چاوەڕێ دەکەین تا بەرنامەکە دەبێتەوە وەک لە وێنەی ژمارە (٢) دەردەکەوێت ئینجا ڕاستەوخۆ کلیک لەسەر NEXT دەکەین، لە وێنەی ژمارە (٣) وەکو دەردەکەوێت سێ هەڵبژاردەی داوە یەکەمیان کلیک دەکەین ئینجا NEXT کلیک دەکەین، دواتر چوارگۆشەیەک لەگەڵی دەردەکەوێت کلیک لەسەر OK دەکەین لەگەڵ دەرکەوتنی چوارگۆشەی دوای ئەو بە هەمان شێوە کلیک لەسەر NEXT دەکەین داوات لێدەکات کەمێک چاوەڕێ دەکەیت دوایی لە وێنەی ژمارە (٤) دا ئەو بەشە لە هارد دیاری دەکەین کە دەمانەوێت کردارەکەی لەسەر جێبەجێ بکەین، ئینجا کلیک لەسەر NEXT دەکەین، چوارگۆشەی دوای ئەویش ڕاستەوخۆ کلیک لەسەر NEXT دەکەین دوایی ڕاستەوخۆ دەست



وێنەی (٢)



وێنەی (٣)



وێنەی (٤)

دەکات بە گەران بە دوای ئەو فایلانەدا کە سڕاونەتەوە . وەکو لە وێنەی ژمارە (٥) دەردەکەوێت دوای تەواوبونی و گەیشتنی بە ١٠٠٪ ئەو چوارگۆشەی دێتە بەر دەستت کلیک لەسەر OK بکە دوایی چوارگۆشەیەکی وەکو وێنەی ژمارە (٦) دەردەکەوێت، وەکو لەوێنەی ژمارە (٦) دیارە کلیک لەسەر ئەو بەشە هاردە دەکەین و دەست نیشانی دەکەین کە بە (MY HARD ) ئاماژەی بۆ کراوە لە دوایش شوێنێک لە بڕاوسەکەوە دیاری دەکەین. پاشان کلیک لەسەر NEXT دەکەین و ڕاستەخۆ داوای خەزنکردنمان لێدەکات بە ناوێکەوە خەزنی دەکەین وەک وێنەی (٧) کە ئەمەش وەکو ڕاپۆرتی ئەم کارە دەردەکەوێت .



وێنەی (٥)



وێنەی (٦)



وێنەی (٧)

# بەرنامەی VCD.CUTTER ڤیدیۆ سیدی کەتەر

ئا: بێستون عمر

وێنەی (١)

ئەوبەرنامەیە بەکاردێت بۆ برینی پارچە ڤیدیۆ بەشێوەیەک کەتۆ دەتەوێت لەگۆرانیەک یان فلیمەک پارچەیەکت پێویستە دەتوانی لەرێگای ئەوبەرنامەیە ئەم کارە ئەنجام بدەیت

چۆنیەتی بەکارهێنانی:

ئەوبەرنامەیە لەناو فۆلدەرێکە فۆلدەرەکەش چەند فایلێکی تێدایە بەلام تۆتەنها پێویستیت بە VCD.CUTTER دەبێت بەرنامەکە دەکەیتەوە لەرێگای فایلەوە دێتە OPEN MOVIES کلیکی لەسەر دەکەیت بەم شێوەیە وێنە(١)

لیستێک دەکەوێتە بەرچاو داوای پارچە ڤیدیۆدەکات تۆش ئەوپارچە ڤیدیۆیەی لەناو هاردی کۆمپیوتەرەکەت داناوە کلیکی لەسەردەکەیت و ئینجا OPEN لێدەدەیت بەم شێوەیە، وێنە(٢)

دەبینین پارچە ڤیدیۆکە دێتە ناو بەرنامەکە هەروەها لەخوارەوەی بەرنامەکە چەند شتێک دیارەکە بە شێوە دروستکراوە بەلام کاتێ ماوسی لەسەریان رادەگری شێوەکان چەندشتێک لەژێریان دەنووسرێت وە PLAY STOP PAUSE

**STEP1** : تۆلەوشوێنەی سەرەتای ئەوڤیدیۆیەی کەپێویستتە بیبری **F5** لێدەدەیت و پاشان گەربتەوێ **PLAY** بکەیت ئینتەر لێدەدەیت بەلام گەربتەوێ بەخێرایی پارچە ڤیدیۆکە برۆینیت**PAGE DOWN** لێدەدەیت تائەوشوێنەی مەستتە ئینجا **F6** لێدەدەیت پاشان **F7** لێدەدەیت پاشان **F8** لێدەدەیت لیستێک دەکەوێتە بەرچاو لەبۆشایی خوارەوەی لیستەکە ناوێک یاخود ژمارەیەکی بەکەیفی خۆت دەنووسی ئینجا **SAVE** لێدەدەیت بەم شێوەیە، وێنە (٣).

ئینجا چاوەرێ دەکەیت بەرنامەکە تا ژمارەی (١٠٠) دەژمێرێت دەبینیت تەنها ئەو پارچەیەی مەبەستە جیابۆتەوە لەڤیدیۆکی ئەو بەرنامەیە زۆر شتی گرنگی پێ ئەنجام دەدرێت بەلام لەوانەی داهاتوو باسی دەکەین.

وێنەی (٢)

وێنەی (٣)




وینەی (١)

# زنجیرەی (٢) بۆ فێربوونی بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ پرۆ

ئا: فاخر محمود میرزا

بەرێزان لەوانەی پێشو ئاماژەمان بەو بەرنامەیە کردبوو کەیەکێکە لەوبەرنامە زوربەنرخانەی کەلەجیهان لە دونیای ریکلام و لیکدانی فیلم و واتا (مونتاج)و جوانکاری ڤیدیو و گەلی شتی تر وینەی دەکمەنە .ئیمەش لەوسەردەمەکە خەریکە بەتەواوی لەگەل دونیای گورانی و فیلم و ریکلام ئاشنادەبین زور زور پیویستمان پییەتی ئەم بەرنامەیە بەکارهینانی بەوشیوەیە گران نیە کە ئیمە نەتوانین سودی لیوەربگرین بەلکو زور سادەو ساکارە ئەگەر لیی ووردبینەوە . چەند شتیکی دیاری کراوی هەیە کەئیشەکان دەکات بونمونە (FILE) فایل لەوئاراستەیەدا چەند شتیک دەردەکەویت لەوانە ١- (OPEN) بوکردنەوەی فایلی جوری ئەم بەرنامەیە دەکاتەوە ٢- SAVE AS بوخەزنکردن بەکاردیت واتا تو ئیشیکت کردوە ناتەوی بروات و دەتەویت هەلی بگری بوکاتیکی تر، وینەی (١)

هەروەها بوکردنەوەی پارچە ڤیدیو ئەم بەرنامەیە توانای کردنەوەی زور جوری ڤیدیوی هەیە لەوانە MPEG – AV – AUDIO JPG-BMP و زور شتی تر لەریرەوەکانی خوارەوە بەلای راست کلیک دەکەیت ئەم لیستە دیتە بەرچاو وینەی (٢)

VEDIO FILE کلیک دەکەیت و ئەویش داوای ڤیدیوت لیدەکات توش ئەو پارچەشتەی پیویستتە ئیشی لەسەر

بکەی OPEN دەکات ئینجا ماوسەکەت بەرەو خوارەوە دینیت لە ریزەوەکانی خوارەوە هێڵێکی رەش دروست دەبیت یەکجار کلیک دەکەیت و ڤیدیۆیەکە لەوێدا جێگیر دەبێت بەم شێوەیە، وێنەی (۳)

۳- CRAETE VEDIO FILE ئەوەیان پاش تەواو بوونی کارەکەت دەتەوێت هەمووئەوکارانەی کردووتە ببێتە پارچە ڤیدیۆیەک لەرێگای CRAETE ئەم لیستە دەکەویتە بەر چاو لەوێوە VEDIO FILE کلیک دەکەیت، وێنەی (٤)

لەوبۆشاییەی کەلەوێنەکەدا دیارە ناوێک یاخوود ژمارەیەک دەنووسی پاشان کلیک لەسەر SAVE دەکەیت ئینجا چاوەڕێ دەکەی وەک ئەم وێنەی ژمارە(٥).



وێنەی (۲)



وێنەی (۳)



وێنەی (٤)



وێنەی (٥)

# چۆنێتی جیا کردنەوەی دەنگ لە گۆرانییەکی دەنگ و ڕەنگی

ئا: هاوکار رحمان




وێنەی (١)

زۆر جارهەیە کەدەمانەوەی دەنگ لە دەنگ و ڕەنگ وەر بگرین و تەنها دەنگەکە بەکار بێنین بەرنامـــەی (Sound Forge) کە زۆر بەئاسانی و بەخێرایی دەنگ لە دەنگ و ڕەنگ جیا دەکاتەوە.

سەرەتا دوای کردنەوەی بەرنامەکە بۆ جیا کردنەوەی دەنگێک دەچینە سەر لیستی File و لەوێشەوە فەرمانی OPEN هەڵدەبژێرین و دەچینە سەر هاردەکان ئەو دەنگ و ڕەنگە وەردەگرین کە دەمانەوێ کاری تێدابکەین بڕوانە وێنەی (١).

دەبێ جۆری فایلەکە File Tybe لەسەر هەمووی کراوەکان دابنرێت (All TYPES) بۆ ئەوەی هەموو جۆرەکانی دەنگ و ڕەنگمان نیشان بدات بڕوانە وێنەی (٢).

ئنجا فایلە دەنگ و ڕەنگیەکە هەڵبژێرە و کلیک بکە لەسەر فەرمانی OPEN بڕوانە وێنەی (٣).

پاش چاوەڕوانیەکی کەم دەبینین فایلە دەنگ و ڕەنگیەکەمان بۆ دەکرێتەوە بەلام لێرەدا و لەم بەرنامەیەدا کاتی کردنەوەی فایلەکە ڕاستـــە و خۆ ئـــەو فایلە دەنگ و ڕەنگیـــە دەبێتـــە فایلی دەنگـــی واتا تەنها دەنگەکە دەمێنێتەوە بڕوانە وێنەی (٤).

ئنجا بۆ پاراستنی فایلەکە دەچینە سەر لیستی File و لەوێشەوە فەرمانی




وێنەی (٢)


وێنەی (٣)


وێنەی (٤)


وێنەی (٥)


وێنەی (٦)

SAVE AS هەڵدەبژێرین بۆ ئەوەی لە ناو ئامێرەکەماندا خەزنی بکەین بڕوانە وێنەی (٥). ئنجا لە کۆتاییدا بەو شێوەیەی بمانەوێ خەزنی دەکەین ئەگەر بەشێوەی WAVE بێت یان MP3 بێت، بڕوانە وێنەی (٦).

## ڕوون کردنەوەیەکی پێویست

لە ژمارە ( ١ ) گۆڤارەی کۆمپیوتەر بابەتێک بە ناوی (ئەنتەرنێت چیە) کە گوایە بەڕێز (مەزهەر جەعفەر) وەریگێراوە بڵاو کرابووە لەو بابەتەدا ئاماژە بە سەرچاوەی بابەتەکە نەکرابوو بۆیە بە داوای لێبوردنەوە ناوی سەرچاوەی ئەو بابەتە کە مەلزەمەیەکە بۆ فێربوونی ئەنتەرنێت کە لە ئامادە کردنی بەڕێز (گۆران عەزیز) لەم ژمارەیەدا بڵاو دەکەینەوە ومافی بڵاو کردنەوەی ئەو بابەتە بە مافی بەڕێز گۆران عەزیز دەزانین .

# زنجیرەی (٢) بۆ فێربوونی بەرنامەی MULTIMEDIA BUILDER



وێنەی ژمارە-١

## ئا: باوکی ئاڵا

سەرەتا لەم زنجیرەیەدا باسی دروست کردنی شێوەی کردنەوەی ڕاستەو خۆ (AUTORUN) دەکەین بۆ هەندێک بەرنامە کە لە چەند پەڕێک پێک هاتبێت.

لەسەر ڕووبەری شاشەکە بەرنامەی مالتی میدیا بیلدەر بە دوو جار کلیکی لای چەپ بکەرەوە و چاوەڕوانبە تا ڕووبەری بەرنامەکەت بو دەکرێتەوە ئنجا لە ناو ڕووبەری بەرنامەکە یەکەم هەنگاو پێویستە قەبارەی ئەو پەڕە دیاری بکەیت کە کردنەوەی ڕاستەو خۆ (AUTORUN)کەی لەسەر دروست دەکەیت چونکە هەر هەمان قەبارەت بو دەردەکەویت لەسەر ڕووبەری شاشەکە و بە ئارەزووی خۆت دەتوانی قەبارەکە دەست نیشان بکەیت بۆ نموونە دەتوانی قەبارەکە بکەیت بە (٨٠٠*٦٠٠) یان (١٠٢٤*٧٦٨) کە ئەو کارەش لە بەشی SETTINGS لەسەر شریتی MAIN بڕوانە وێنەی ژمارە ( ١ ) دوای ئەوەی کە قەبارەی پەڕەکە دیاری دەکەیت دەبینی شێوەی پەڕەکە لە ناو ڕووبەری بەرنامەکە گەورەتر دەبێت ئنجا دەتوانن چەند پەڕێکی تر زیاد بکەین بە پێی پێویستی خۆتان بۆ نموونە ئێمە (٢) پەڕی تر زیاد دەکەین تا بە هەموو پەڕەکان ببن بە ( ٣ ) پەڕ بڕوانە وێنەی ژمارە ( ٢ ) دوای ئەوە دەتوانن لە ناو پەڕی یەکەم وێنەیەک دابنێین بە هۆی فەرمانی BITMAP کە لە وێنەکە ئاماژەی بۆ کراوە لەگەڵ هێنانی یەک کلیل بە هۆی



وێنەی ژمارە-٢




وێنەی ژمارە-٣

فەرمانی BUTTON کە لە وێنەکە ئاماژەی بۆ کراوە و وێنەکە بۆ جوانی ڕوخساری کردنەوەی ڕاستەو خۆ (AUTORUN)کەیە و کلیلەکەش بۆ چوونە سەر پەڕیکی تره بڕوانە وێنەی ژمارە ( ٣ ) دواتر دەتوانین لە پەڕی دووەمەدا وێنەیەکی تر دابنێین و چەند کلیلێك لەسەر وێنەکە دابنێین بۆ نموونە ئەگەر ویستت ١٢ بەرنامە لە ناو ئەو سیدیە دابنێیت ئەوە ١٢ کلیلە لەسەر وێنەکە دابنێ و ناوی ئەو بەرنامانەی کە دەتانەوێ لە شێوەی کردنەوە ڕاستەو خۆ (AUTORUN )کە دابێت لەسەر کلیلەکان بنووسە بۆ نموونە هەر کلیلە و ناوی بەرنامەیەکی لەسەر بنووسە و هەروەها دەبێت ( ٢ ) کلیلی تر دابنێن بۆ گەڕانەوە و بۆ چوونە سەر پەڕیکی نوێ بڕوانە وێنەی ( ٤ ) دواتر پێویستە ئەو ١٢ بەرنامەیەی کە دەتەوێ شێوەی کردنەوەی ڕاستەو خۆ (AUTORUN )کەی بۆ دروست بکەیت بە جیا لە ناو فۆڵدەرێکدا بێت بۆ ئەوەی بتوانی بە ئاسانی شێوەی دامەزراندن ( SETUP ) ی بەرنامەکە بگوازیتەوە بۆ سەر ئەو کلیلەی کە ناوی بەرنامەکەت لەسەر نووسیوە ئنجا دوای ئەوە دەچیتە سەر ئەو کلیلەی کە ناوی بەرنامەکەت لەسەر نووسیوە بۆ نموونە ئەو کلیلەی کە ناوی بەرنامەی ماکسی لەسەر نووسراوە دوو جار کلیکی لای چەپی لەسەر بکەن شێوەیەکتان بۆ دەردەکەوێ لەو شێوەیەدا کلیک بکەن سەر فەرمانی ( EXTERNAL COMMAND ) دواتر شێوەیەکی ترتان بۆ دەردەکەوێ لەو شێوەیەدا و لە بۆشایی بەرامبەر فەرمانی ON MOUSE CLICK فەرمانی RUN PROGRAM هەڵبژێرن و لە بۆشایی ژێرەوەش کلیک بکەن لەسەر ئەو سێ خاڵەی کە لە تەنیشت بۆشاییەکە هەیە دواتر شێوەیەکی ترتان بۆ دەردەکەوێ لەو شێوەیەدا ئەو فۆڵدەرە هەڵبژێرە کە بەرنامەکانت لە ناودا دانانەوە دواتر بەرنامەکە هەڵبژێرە و کلیک بکە لە سەر ئەو بەشەی کە بەرنامەکە دادەمەزرێنێ مەکە (SETUP)بڕوانە وێنەی ژمارە (٥)

تێبینی: لە زنجیرەکانی تری بەرنامەکە باسی بەشەکانی تری ئەم بەرنامەیەتان بۆ دەکەین چاوەڕوان بن.



وێنەی ژمارە-٤



وێنەی ژمارە-٥

# سڕینەوەی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر




وینەی (١)

ئا: سلیم قادر

بۆ ئەوانەی زانیاری سەرەتایان هەیە لە کارکردن لە کومپیوتەردا، بۆ ئەوانەی تا ئیستا نەیانزانیوە مەبەست لە ریموڤکردنی بەرنامەیەکی کومپیوتەر چیە، بۆ ئەوانەی لە سودەکانی ئەم تایبەتمەندیەی کومپیوتەر بگەن دەمەوی زور بە سانایی ئەم کردارەی کومپیوتەر فیربیت بزانیت لە چ کاتیکدا بەکاری دینیت . ریموڤ کردنی هەر بەرنامەیک لە ناوکومپیوتەر واتە سڕانەوەو نەمانی ئەم بەرنامەیە بەهەموو پیک هاتەو کارکردنی تەنها ئەو فایلانەی دەمیننەوە کەوا خەزن کراون، ئەم کردارە بۆ ئەو کاتانەیە کەکارکردنت بە بەرنامەیەکەوە نەمابیت و شوینی لە ناو کومپیوتەر گرتبیت، یان هەندیک بەرنامە هەن زور گرانن لە دابەزاندن و دامەزراندنیان لە ناو کومپیوتەر بویە پیویست دەکات دوای تەواوبوونی کارەکانت و ئیتر پیویستت بەم بەرنامەیە نابیت ریموڤی بکەیت، زوریک لەو کەوسانەی کە کومپیوتەر بەکار دینن وادەزانن کە تەنها سڕینەوەی ئەو فایلانەی بەناوی بەرنامەکەوەن لە سەر روپەری شاشەوەن یان لە لیستی بەرنامەکاندان ئەوا تەواوی بەرنامەکەی سڕیودتەوە بەلام ئەمە هەلەیەو کاریگەریشی دەبیت لەسەر خیرایی و خاوکردنەوەی کومپیوتەردکەت.




وێنەی (٢)

چونکە بە رنامەکە لەکاتی دامەزراندنی لە ناو کۆمپیوتەر لەناو زیاتر لە شەش شوێنی ئەم کۆمپیوتەرە فایلەکانی خەزن دەبن بۆیە لەکاتی سرینەوە تەنها فایلی ئەم شوێنانە دەسرینەوە، بۆیە ئامۆژگاری بەکارهێنەرانی کۆمپیوتەر دەکەم کە لەکاتی پێویست نەمانیان بە هەر بەرنامەیەک ریموڤی بکات تاکو کۆمپیوتەرەکەی لە کارکردن خاو نەبێت و بشتوانێت کار بە زۆربەی بەرنامەکان بکات .

هەنگاوەکانی ریموڤ کردنی هەر بەرنامەیەک لە هەموو ویندۆزەکان وەک یەکە لە بنچینەدا کەبریتیە لە دەست نیشان کردنی بەرنامەکەو پاشان ریموڤکردنی، هەنگاوەکانی ریموڤکردنی هەر بەرنامەیەک لە ویندۆزی ئێکسپیدا بەم شێوەی خوارەوە :

لە سەرەتادا دەچینە سەر (START) دوایی دەچینە سەر (SETTING) ئینجا کۆنترۆل پەناڵ هەڵدەبژێرین (CONTROL PANAL) بڕوانە وێنەی ژمارە (١) دوایی ڕاستەوخۆ بەشی دانان و سرینەوەی بەرنامەکان هەڵدەبژێرین (ADD OR REMOVE PROGRAMS) وەک لەوێنەی ژمار (٢) ئینجا کۆمپیوتەرەکە بە خۆی لە بەشی سرینەوەی بەرنامەکانەو کامە بەرنامەت مەبەستە ناوەکەی دیارەوە دەست نیشانی دەکەیت و کلیک لەسەر ریموڤ (REMOVE) دەکەیت وەک ڕونکراوەتەوە لە وێنەی ژمارە (٣) دوای کلیک کردن چوارگوشەیەک دەردەکەوێت پرسیار دەکات کە ئایا دڵنیات لە ریموڤ کردن یان نا تۆش وەڵامی دەدەیەوەو بەرنامەکە ریموڤ دەبێت .




وێنەی (٣)







# مەبەست لە mp3 چیە؟

ئا: تریفە خلیل

زۆربەمـان گوێبیسـتی ئـەم زاراوایە بوینـەو تـا ئێسـتا لـە ماناکـەی لەگەڵ سودەکەی نەگەیشتوین بە شێکی زۆریش لە ئێمە بەکاری دێنین و گوێ لە مۆسیقاو گۆرانی دەگرین بە هۆی ئەم بەرنامەیەوە بـە تایبەتی لە سـەر تـۆری ئەنتەرنێت، بۆیە من بە پێویسـتی دەزانم زانیاری و ئالیەتی کارپێکـردن و کۆگاکردنی دەنگ لەسەر MP3 چۆنەو چۆن کارناکاتە سەر مۆسـیقاو گۆرانیەکان بـاس بکەم . تاکو زانیاریت لەسەر گرنگی MP3 و پێکهاتەو جیـاوازی ئـەم بەرنامـە دەنگیـە لەگەڵ ئەوانی ترو سـودو مەوداکانی کارکرنی هەبێـت . MP3 فایلێکـی بچوککراوەیـە بەهۆی پاڵە پەسـتۆوە بۆئـەوە کرداری دابەزاندنـی لـە ئەنتەرنێـت ئاسـان بێت چونکـە زۆربـەی فایلـە دەنگیـەکان بە شـێوەی MP3 دەگوازرێنـەوە تاکـو کەمتریـن نرخی تێچـووی هەبێ چونکە MP3 کەمتریـن قەبـارە داگیـر دەکات. ئەم پاڵپەسـتۆیەی کـە فایلێکی MP3 پێ دروسـت دەکرێت هیچ کاریگەری نابێت لەسەر دەنگ و باشی و خراپی دەنگەکەو پچرانـی . ئەم تایبەتمەندیـەش وادەکات قەبارەکەی بچووک بێتەوەو ڕووبەرێکی بچووک لەسـەر سـیدی داگیر دەکات و دەتوانرێت زۆر بەئاسانی لەڕێگای تۆڕی ئەنتەرنێتـەوە ئاڵوگۆری پـێ بکرێت، لە لایەکی تریش دەتوانین لە ڕێگایی پۆستی ئەلیکترۆنیـەوە بنێردرێـت یـان وەری بگرێت.

ڕێـگای تۆمارکردنـی دەنـگ لـە کۆمپیوتـەر لـە سـەر شـێوەی (WAV) خـەزن دەکرێـن بەلام قەبـارەی فایلەکە گەورەیـە بەڕادەیەکـی زۆر بۆنمونـە ئەگـەر پارچەیـەک دەنگ تۆمـار بکەیت کاتەکـەی تەنهـا چوار دەقیقـە بێت ئەوا ٤٠ مێـگا بایـت داگیـر دەکات لە خەزن کردنی . ئێسـتا ئێمـە دەتوانین بە ڕێگای بچوککردنـەوەی قەبـارەی فایلـەکان بە پەسـتاندن سـەدان فایلی دەنگـی تۆمار بکەین بە توانایەکە بەرزیش، بەبێ ئەوەی ڕووبەرێکـی گەورەش لە ناو کۆمپیوتەر داگیر بکات . ئەنجام دانی ئەم پەستانەش لەسەر ئەساسی سیستەمە بیرکاریەکانە بە پشـت بەستن بە یاسـا بیرکاریەکانی خەواریزمی دروست دەکرێت لە فایلەکانی MPEG1. LAYER 3 بەلابردنی بەشـێک لە زانیاریەکانـی فایلەکە . لە هەمان کاتدا پشت دەبەستێت بە بنەما سەرەکیەکانی بیـردۆزی دەنگیـەکان ئەویـش بـە لابردنـی هەمـوو دەنگـە دوبـارەکان و ئـەو دەنگانـەی کـە پەیوەندیـان بە دەنگـە سـەرەکیەکەوە نیـە، هەروەها لابردنـی هەمـوو ئـەو دەنگانـەی کە گوێی مرۆڤ ناتوانی بیانبیستێت وەکو شەپۆلەکانی سەروی دەنگ و خواروی دەنگـی بیسـتراو . ئەم سیسـتەمە لە چـاو سیسـتەمەکانی تـر دەتوانێت بە تواناتر کاربکات چونکە یەک دەقیقە بە هـەر بەرنامەیەکی تر بێـت ئەوا MP3 ئەم فایلـە کەمی دەکاتـەوە بە ڕێژەی ١بۆ ١٢. لەگەڵ پاراسـتنی چوسـتی و چالاکیەکـەی . ئەم سیسـتەمەی فایلە دەنگیەکان تەنها کیشەک کە بەربەستی بێت بریتیە لە بە ئاسـانی کۆپی کردن و لـە بەرگرتنـەوەی فایلـە دەنگیەکان کە ئەمەش لەگەڵ ڕیسـاکانی یاسـای کۆمپانیـە هونەریەکان یەک ناگرێتەوە. دەتوانرێـت لـە هەرکۆمپیوتەرێـک کـە سیسـتەمەکەی وینـدوز بێت یان بەرنامـەی REAL PLAYER. . . ، MEDIA PLAYER هەبێـت دەتوانیـت گـوی لە فایلە دەنگیەکانی MP3 بگرێت .

# چۆن وێنەیەک یەدەک لە زانیاریەکانت دروست دەکەیت back up




ئا: هاوێر ئەردەلان

ئایا هیچ ڕۆژێک هەڵساویت و زانیارەکانی خۆت لە ناو کۆمپیوتەر دانەیەکی یەدەکت لێی پاراستبێ، ئایا ئەوە دەزانیت ژمارەی تەلە فۆنە پێویستیەکان و ناونیشانەکانی پۆستی ئەلیکترونی و فایلەکانی تایبەت بە پارەوە شتە گرنگەکانی ژیانی خۆت، گەورەترین سەرمایەن کەترسی ونبوونیان لێبکرێت، وە ئەم فایلانەت لە ناو کۆمپیتەر قابیلی وون بوون و لە ناوچونن ئەویش لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە : یان لە ئەنجامی هەڵەیەکی بچوکەوە لە کاتی کارکردنت، یان لە ئەنجامی ئاگر کەوتنەوەیەک یان دزینی کۆمپیوتەرەکەت یان تێکچونی کۆمپیوتەرەکەت، یان لە ئەنجامی توشبونی کۆمپیوتەر بە ڤایرۆس یان لە ئەنجامی دەسکاریکردنی خەڵکی تر و سرینەوەی فایلە گرنگەکان لە ناو کۆمپیوتەردا . خۆ ئەگەر کۆمپیوتەرەکەش تێکچوو یان سیستەمەکەی هەڵەی تێکەوت ئەوا دەتوانین چارەسەری بکەین و زانیاریەکان نەفەوتێن بەڵام کردارێکی گرانەوە لە ڕووی مادیەوە نرخی تێچونی زۆرە لە هەمان کاتدا زۆرێک لە زانیاریە گرنگەکان ناگەڕێنەوە بۆ ناو سیستەمەکەوە، وەکاتێک ئەم کارەمان تەواوکرد دەتوانین بۆ ڕۆژە دژوارەکانی بەکاربێنین ئەم دانە یەدەکە پێویستی بەمە نیە کە تەواوی سیستەمەکە یان بەشێکی باک ئەپ بکەین بەڵکو هەموو فایلە گرنگەکان بۆ نمونە وۆردو ئەکسڵ و ئەکسس و هتد، چونکە دەتوانرێت بەشەکانی تر لە ڕێگای ئەنتەرنێت دەستە بەربکەین بەڵام فایلە تایبەتەکان ناگەڕێنەوە کردارەکە زۆر سانایە دەبێت ئەم فایلانە لەسەر سیدی و فلۆپی دادەنرێت یان هاردی جیاواز خارجی، بەڵام فلۆپی دیسک قەبارەی خەزنکردنی بە هەموشتەوە ١,٤٤ میگا بایتە بەڵام سیدی ٦٥٠ میگابایتی دەگرێت کەواتە کارئاسانی تێدا دەکرێت، وە بۆ ئەوەی دەست بکەین بە خەزنکردن پێویستە سیدیەک بخەینە ناو سیدی ڕایتەرەوە، ئینجا ویندۆئیکسپلەوەر بکەرەوە بۆ کردنەوەی ئەم بەشەش لە فەرمانی دەست پێکردن (START) کلیک دەکەین و دەچینە سەر هەڵبژاردەی بەرنامەکان و (PROGRAMS) لەوێ دەچینە سەر کۆمەڵەی ACCESSORIS ، لە وێش WINDOWS EXPLORER هەڵدەبژێرین وەک وێنەی ژمارە (١) ئینجا چاوەڕێ دەکەین تا چوارگۆشەکە دەکرێتەوە پاشان دەست دەکەین بە دەست نیشانکردنی ئەو فایلانەی بمانەوەێ باک ئەپ بکەین دوایی بە ماوسەکە رایان دەکێشینە ناو سیدیەکە تاشوێنی دەبێت، یان دەتوانین راستەوخۆ ئەو فایلانەی کە دەمانەوێت باک ئەپیان بکەین لە ناو فۆڵدەرێک هەڵیان دەگرین و دوایی لە ناو سیدیەک خەزنیان دەکەین بەڵام ئەم ڕێگایە ماندووبوون و تێچونی زۆرترە وەک ئەوەی تریان لە هەمان کاتدا ئەم ڕێگایە ئەگەری لەیاد چونی فایلەکانیشی لێدەکرێت . لێرە من ئامۆژگاریتان دەکەم کەوا هەرکەسەو ئەو زانیاریە گرنگانەی ناو کۆمپیوتەرەکەی باک ئەپ بکات تا لە مەترسی لە ناوچون بیان پارێزێت . یان بۆ ئەوەی لە ڕۆژە گرنگەکان لە شوێنی تر بڕوانێتە زانیاریەکان و بەکاریان بهێنیت .

# بەکارهێنانی سەرچاوە زانستیەکان لە ڕێگای ئینتەرنێت بۆ سوود وەرگرتن لە بواری خوێندن و توێژینەوەدا




وێنەی ژمارە-١

ئا: زانیار جبار

لە ڕۆژانی ئەمرۆماندا ژمارەیەکی زۆر سایتی تایبەت بە پەرتووکخانەو زانکۆو دەزگا زانستی و توێژینەوەیی هەیە کە پەرتووکی زۆریان بە شێوەی فایلی ئەلکترۆنی لەسەر سایتەکانیان ئەخەنە بەردەست بەکارهێنەر بۆ بڵاوکردنەوەی توێژینەوەکانیان و زانیاریەکان تاکو بەکارهێنەر لە هەموو جیهاندا بتوانێت سوودی لێ وەربگرێت، زۆرێک لەم سایتانە تارادایەک بەخۆڕاییە بەڵام سایتی واش هەیە کە بە بەشداریەکی کەم بواری بەکارهێنانی ئەدات.

جگە لەمە هەر بەشێک لە کۆلیژێک لە زانکۆ بەناوبانگەکانی جیهان سایتێکی تایبەت بەخۆی هەیە بۆ پێشکەش کردنی خزمەتەکانی چ لە بواری فێربوون و توێژینەوەو یان لە بورای بەکارهێنانی پەرتووکخانەی تایبەت بە خۆیان بۆ وەرگرتنی زانیاری.

بۆنموونە: باسی سایتی WWW.GEOLOGY.COM دەکەین کە لە ناوەکەیەوە دیارە تایبەتە بەبواری زانستی جۆیۆلۆجی، کە زانیاری و بابەتی ڕێک و پێک ئەخاتە بەردەست بەکارهێنەر کە زۆر بەسوودە بۆ قوتابیانی بەشی جیۆلۆجی لە قۆناغی یەکەمەوە تا کو خوێندنی باڵاش.

بۆ کردنەوەی ئەم سایتە: ١- بەرنامەی ENTERNET XPLORER بکەوە. ٢- ئنجا لە لیستی ADDRESS ناوی سایتەکە WWW.GEOLOGY.COM بنووسە ئنجا ٣- کلیک بکە لەسەر دوگمەی GO. دوای ئەوە چاوەڕوان بکە تاکو لاپەرەی سایتەکە دێتە سەرشاشە، وێنەی (١).




وێنەی ژمارە-٢

لەم لاپەرە سەرنجی ئەوە دەدەین کە بابەتەکانی زانستی جیۆلۆجی بەشێوەیەکی ڕێک و پێک ڕێکخراون پۆلین کراون، بۆ کردنەوەی هەر بابەتێک یەک کلیک بکە لەسەر ناونیشانی بوارەکە کە بە ڕەنگی شین نووسراوە، وێنەی (٢).

تێبینی: بۆ دۆزینەوەی زانیاری لەسەر هەر بابەتێک یان زانستێک، ئەتوانیت یەک لە ڕێگاکانی گەڕان SEARCH بە دوای تێکستدا بەکاربهێنیت، وەکو WWW.GOOGLE.COM یان WWW.ASK.COM یان هەر ڕێگایەکی تری بۆ گەڕان لە ئینتەرنێت.

بۆ نموونە لەکاتی بەکارهێنانی WWW.GOOGLE.COM

دوای کردنەوەی ماڵپەڕەکە، لەناو خانەی گەڕان ئەو دەستەواژە زانستیە بنووسە کە ئەتەوێ بەدوای دابگەڕێیت ئنجا کلیک بکە لەسەر دوگمەی GOOGLE SEARCH، وێنەی (٣).




وێنەی ژمارە-٣

# چۆن بزانین کۆمپیوتەرەکەمان هاک کراوە یان نا؟
## ڕێگایەکی زۆر ئاسان تاقیکراوە ١٠٠٪



**هەردەوان نەقشبەندی***
hardawan@gmail.com

زۆرجار لەکۆمپیوتەرەکەمان بەگومان دەبین لەوەی کە هاک کرابێت یان نا، لەوانەیە زۆرێک لەپرۆگرامەکانی دژەشکان و ئەنتی ڤایرۆس تاقیبکەینەوە هەتاوەکو لەکۆمپیوتەرەکەمان دڵنیابین کەئەمەش کاتێکی زۆرو ماندوبونێکی زۆری دەوێت بەڵام ئەم ڕێگایەی خوارەوە نەکاتێکی زۆرو نە ماندوو بون و نەپرۆگرامیشی دەوێت تەنها بەجێبەجێکردنی چەند هەنگاوێک بەئاسانی دەتوانیت بزانیت کۆمپیوتەرەکەت هاک کراوە یان نا؟ وە ئەنجامەکەشی لە ١٠٠٪ تەواو و دروستە:

١- بۆ ئەو کۆمپیوتەرانە کەسیستمی کارپێکردنی ویندۆزی ٩٨ یان ویندۆزی ME بەکاردێنن: کلیک لەسەر(START) پاشان (RUN) پاشان لەناو بۆشاییەکە ئەمە وەک خۆی بنووسە SYSTEM.INI پاشان کلیک لەسەر (OK) پەڕەیەک بۆ دەکرێتەوە سەیری دێڕی پێنجەم بکە ئەگەر بەم شێوەیەبوو:

USER.EXE=USER.EXE

ئەوە دڵنیابە ١٠٠٪ کەوا کۆمپیوتەرەکەت سەلامەتەو هاک نەکراوە بەڵام ئەگەر هاتوو دێڕی پێنجەم بەم شێوەیە بوو:

*** *** *** USER.EXE=USER.EXE

ئەوە بزانە کۆمپیوتەرەکەت هاک کراوەو بەزوترین کات کاری پێویست ئەنجام بدە بۆ چارەسەرکردنی.

٢- بۆ ئەو کۆمپیوتەرانە کەسیستمی کارپێکردنی ویندۆزی ٢٠٠٠ یان ویندۆزی XP بەکاردێنن: کلیک لەسەر(START ) پاشان (RUN) پاشان لەناو بۆشاییەکە ئەمە وەک خۆی بنووسە SYSTEM.INI پاشان کلیک لەسەر (OK) پەڕەیەک بۆ دەکرێتەوە سەیری پەڕەکە بکە ئەگەر لەدێڕی چوارەم ئەستێرەت (*) بینی ئەوە بزانە کەسیستمەکەت هاک کراوە بەڵام ئەگەر هیچ ئەستێرەی تیانەبوو ئەوە بزانە کەوا کۆمپیوتەرەکەت سەلامەتەو لێی دڵنیابە.

```
FOR 16-BIT APP SUPPORT
[DRIVERS]
WAVE=MMDRV.DLL
*** *** ***TIMER=TIMER.DRV
```

(بونی ئەستێرە * لێرەدا بەڵگەیە لەسەر هاک کردنی کۆمپیوتەرەکەت).

```
[MCI]
[DRIVER32]
[386ENH]
WOAFONT=DOSAPP.FON
EGA80WOA.FON=EGA80850.FON
EGA40WOA.FON=EGA40850.FON
CGA80WOA.FON=CGA80850.FON
CGA40WOA.FON=CGA40850.FON
```

# چاکسازی و پاراستنی کۆمپیوتەر

ئا: خلیل جوهر



## چاکسازی و پاراستنی کۆمپیوتەر لە دووجۆری سەرەکی پێک دێت:.

یەکەم:چاکسازی و پاراستنی ناوەوە

بریتیە لە پاک کردنەوەی ئامێری کۆمپیوتەربە پێکهاتەو بەشەکانیەوە و پشکنینی بەشەکانی لە دووبارە بەستنەوەی بەشەکانی،تۆزو خۆل و پاشماوە دەبێتە هۆی بەربەست بۆبەشەکانی ناوەوەو دەبێتە هۆی گرفتی سەرەکی وەکو بەرزبوونەوەی پلەی گەرمی وبەشنەکردنی هەوای فێنک وگونجاو وهۆی نەگەیاندن وبەریەک کەوتنی گەینەرەکانی ناوەوە بۆیە پێویستە (فلتر)ی هەوای تایبەت بە پانکەی فێنکەرەوە پاک بکرێتەوە کە یارمەتی بەردەوامی هاتنی هەوای فێنک وجێگیر دەدات و دەبێتە هۆی ئەوەی هەوایەکی گونجاو بگاتەبەشەکانی کۆمپیوتەر، هەندێ جار تۆزو خۆل وپاشماوە بەربەسنت دروست دەکات لە کاری دەزگا کارەبایەکان بە هۆی بوونی هەندێ مادەی گەینەرو هەروەها پاراستنی ناوەوە بریتیە لە پاککردنەوەی ماوس (MOUSE) لە ناوەوە بەتایبەتی کاتێک بە شێوەیەکی گونجاو کارناکات،پێویستە تابلۆی کلیلەکان (کیبۆرد) هەر شەش مانگ جارێک لە نووسینگەو دەزگاکان و هەر یەک مانگ جارێک لە کارگەو کارخانە گەورەکان بە تایبەتی لە کاتی دەرچوون و بەدیار کەوتنی نامەی (DOS ABORT) IGNORE). ( RETRY)

دووەم:چاکسازی و پاراستنی دەرەوە: بریتیە لە شوێن ودەوروبەری گونجاو بۆ ئامێری کۆمپیوتەر و بەکارهێنانی ئامێری پاراستن وپارێزگاری کردنی لە سەر چەسپاندن و سەرچاوەی سەرەکی هێز و پلەی گەرمای گونجاو پاراستنی ئامێری کۆمپیوتەر لە لەرزین.




پێویستە شوێنێکی گونجاو هەڵبژێردرێت بۆ ئامێرەکە و دوور بێت لە جگەرە کێشان وتیشکی ڕۆژ و شێداری و چاکترە لە شوێنێکی فێنک دابنرێت لەگەڵ ڕەچاوکردنی بەکارهێنانی (ڕێگری بروسکی کارەبا (مانع صواعق الکهربائیة) بۆ پاراستنی ئامێرەکە لە تەوژمی کارەبا ونزمی رادەی شی لە وەرزی زستان کە بەدیار دەکەوێت لەسەر بەشەکانی ڕووی دەرەوەو بەشەکانی تری چونکە ئەم تەوژمانە دەبێتە هۆی لەکارکەوتنی ئامێرەکەو لە کارخستنی بیرخستکەرەوەی (ذاکرة).

چاکسازی و پاککردنەوەی دەرەوە بریتیە لە پاراستنی کۆمپیوتەر لە کاریگەری تەزوی کارەبا ی لابەلا. هێڵی تەلەفۆن و فاکس پێویستە تەنها لە کاتی بەکارهێنانی دابنرێت لەگەڵ ڕەچاوکرنی نەبوونی دەزگای کارەبای کە بەکار دەهێنرێت لە هەمان سەرچاوەی گەینەر لەگەڵ کۆمپیوتەرەکە، باشتر وایە یەکەی نەپچرانی تەزووی کارەبا بەکاربهێنرێت (UPS) کە تەزووی کارەبای بەردەوام دەستەبەر دەکات بۆ ئامێرەکانی تر لە کاتی پچرانی تەزووی کارەبا یا ن بەکار هێنانی راگری چەسپاندنی کارەبا (ڤۆلتاج) لە کاتی بەکار نەهێنانی ئامێری پێشوو.

# (SpeederXP)
# خێرا کردنی ویندۆز ئیکس پی

ئا: عبدالله مولود




وێنەی (١)

بێگومـان هەموومـان پێویستیمان بە خێرابوونی کۆمپیوتەر هەیە کۆمپیوتەریش لەهێزی خۆی زیاتر ناتوانێت خێراتربێت لەوکاتـە پەنادەبەین بـۆ بەرنامەیەک کە بتوانێـت کۆمپیوتەرەکانمـان لەهێـزی خـۆی زیاتر خێرایی پەیدابـکات ئەویش (SPEEDERXP)ە واتا خێراکەری ویندۆز XP ئـەم بەرنامەیەش تایبەتـە بەویندۆز XP واتـا لەسـەر ویندۆزەکانـی تـرکار ناکات، وێنەی (١).

## چۆنیەتی بەکارهێنانی

بەکارهێنانی ئەو بەرنامەیە زۆر ئاسانە پـاش دابەزاندنـی بەرنامەکـە لەسـەر کۆمپیوتـەر دێین بەرنامەکـە دەکەینەوە لەسـەر رووی بەرنامەکـە چەند شـتێک بەدیاردەکەوێت وەک APPLY DEFAULT SETTING HELP ABOUT QUIT هەروەهـا هێلێکـی راسـتیش لەوسـەر بۆئەوسـەر دروسـتکراوە هێمایەکـی لەناوەراسـتە کەسـەرێکیان نووسـراوە SLOW واتـا لەسـەرخۆ ئەویتریـان نووسراوە FAST واتا خێرا لەوکاتە ئێمە دەمانـەوێ کۆمپیوتەرەکەمـان خێرابێت دێین ئاراستەی سەرهێلەکە بۆلای راست دەبەین تاکۆتایی ئینجا APPLYی بەماوس کلیک دەکەین دەبینین کۆمپیوتەرەکەمان زۆر خێراتر بووە لەپێشوو. وێنەی (٢).




وێنەی (٢)

# هزری مرۆڤ دروستکەری هزری کۆمپیوتەرە

شێخ ئاریان عەزیز



ئەو کەسەی بەووردی بیربکاتەوە لەو ئەرکە ئالۆزانەی کە ئامێری کۆمپیوتەر بەئەنجامی دەگەیێنێت هەندێک جار سەرسورمان باڵی بەسەردا دەکێشێت و دەڵێن ئایە ئەو ئامێرە کە لە چەند نەخشەیەکی ئەلکترۆنی و کۆمەڵە وایەرێکی جۆراوجۆر پێکهاتووە چۆن دەتوانێت ئەم هەموو زانیارییە ووردەمان پیشکەش بکات لە هەموو رووویەکەوە، بەلام ئێمە ئەگەر لەڕوانگەی پاراسایکۆلۆژییەوە بۆ ئەم پرسیارە بڕوانین بمانەوێت وەلامی بدەینەوە ئەوا بەشێکی زۆری ئەو سەرسورمانەمان لەلا نامێنێت لە کاتێکدا کە بۆمان دەردەکەوێت ئێمە بەتەنها ڕێژەیەکی زۆر کەمی خانەکانی مێشکمان بەکار دەهێنین کەتەنها لەسەدا پێنج کەمتریش ٥٪ و لە ٩٥٪ خانانەکانی مێشکمان بەکارنەهێناوە، هەر بۆیە دەبینین ئەو کەسەی کە بە باشی وەرزشی هزری دەکات هەر ئەو وەرزشە دەبێت بە هۆی بەکارخستنی ڕێژەیەکی زیاتر لەو ٩٥٪ خانەکانی مێشکی و لەئاکامدا دەتوانێت بەشێکی زۆری توانا لە ڕادەبەدەرەکانی ((پاراسایکۆلۆژی)) خۆی بخاتە کار کە لە ناو ناخی هەموو کەسێکی ئێمەدا هەیە بەلام ئەو بەشە شاراوانە بەدیار ناکەوێت و هەر بەشاراوەیی دەمێننەوە٠ لە ڕێگای ئەم بەراووردکردنەوە ئەو ڕاستیەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کەمرۆڤ پێویستە بایەخێکی گونجاو بدات بە وەرزشی هزری بەشێوەیەکی واکەمتر نەبێت لەو بایەخی کەدەیدات بەفێربوونی کۆمپیوتەر و سەرجەم زانستەکانی تر، هەرچەندە وەرزشی هزری بەشێکە لە وەرزشی یوگا و دەتوانین بڵێین دەروازەیەکی پێویست و ئاشکران بۆچونە ناو جیهانی پاراسایکۆلۆژیەوە٠٠

## داخستنی هەژدە هەزار کۆفی نێت لە چین

وەرگێرانی لە عەرەبییەوە:
نوال زینل

ئەو هەلمەتە فراوانەی کە دەسەلاتدارانی ئاسایشی چینی لە مانگی یەکەوە تا مانگی هەشتی ئەمسال، بووە هۆی داخستنی (١٨) هەزار کۆفی نێت لە کۆی گشتی یەک ملیۆن و هەشت سەد هەزار کۆفی نێت. کە لە سەرانسەری چین ڕووبەڕووی پشکنین بوونەوە . ئەم هەواڵە لەلایەن بەڕێوەبەری ئیدارەی کڕین و فرۆشتن لە وەزارەتی رۆشنبیری چینی یەوە بلاوکرایەوە کە سزاکەشی گەیشتە نزیکەی ١٢ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی ئەو بەڕێوەبەرایەتیە سێ هۆی سەرەکی لە داخستنی ئەو گازینۆیانەی خستە ڕوو. یەکەم ڕێک نەکەوتنی ئەو کارانەکە تایبەت بوون بەو پیشەیە لەگەل یاسای مۆلەت پێدان . لەوانە پیشاندانی وینەی ڕووت و دوور لە ڕەوشتی کۆمەلگا بۆ منداڵان و تۆمار کردن لەو سایتانەو کردنەوەی دەرگای ئەو گازینۆیانە تا درەنگانی شەو ئەوەش وای کردبوو کە ئەو گازینۆیانە کاری تەندروست ئەنجام نەدەن. بەو شێوەیە سەدان شوێن سایتی ئنتەرنێتەکان کۆنترۆل کران. بۆ زانین زیاتر لە ٨٧ ملیۆن کەس لە بواری کۆمپیوتەر کار دەکات، نیوەی زیاتریان لە ژێر (٢٤) ساڵیدان بەمەش چین لە پیشەوەی ئەو دەولەتانەیە کە کارمەندی هەرە زۆری لەو بوارەدا هەیە ئەو کارەی حکومەتی چین لە بەرامبەر گازینۆکانی ئنتەرنێت ئەنجامی دا . و لە سۆنگەی ئەو ڕوداوانەبوو،کە ناوە ناوە ڕویان دەداو ئەو شوێنانە لێی بەر پرسیار بوون خراپترینیشیان ئەو ڕووداوە بوو کە بووە هۆی ئاگرتێبەربوونی گازینۆیەکی ئنتەرنێت و سووتانی ٢٥ قوتابی.

سەرچاوە: موقع الساحة العربیة



# خێراکردنی ویندۆزمی

ئا: کاوە سلیمان



وێنەی (١)



وێنەی (٢)



وێنەی (٣)

خێرا کردنی ویندۆزمی وێنەی (١)

چۆنیەتـی بەکارهێنانی ئەو بەرنامەیـە وەک فۆڵدەریک وایە پاشـکردنەوەی ئەوفۆڵدەرە چەند فایلێک دەکەوێتە بەرچاومان وەک(TWEAKUI)(TWEAKUI)GID.(TWEAKUI CNT) ئێمە لەوانە تەنها ئیشمان بە **TWEAKUI** دەبێت یەک جار کلیکی لای ڕاستی لەسەر دەکەین و فەرمانی **INSTALL** هەڵدەبژێرین بۆدابەزاندنی لەسەر کۆمپیوتەرەکە بڕوانە وێنەی (٢).

ئەو بەرنامەیەش پاش دابەزاندنی لەسەر کۆمپیوتەر ڕاستەو خۆ دەچێتە ناو **CONTROL PENEL** بەم شێوەیە لەناو کۆنترۆڵ پەنال زیاد دەبێت، وێنەی (٣).

لەوێوە دووجار کلیکی لەسەر دەکەین بەم شێوەیە دەبێتەوە، وێنەی (٤).

دەبینین هێڵێکی ڕاست لەسەر ڕووی بەرنامەکە دیار دەکەوێت کەسەرێکیان نووسراوە **FAST** واتە خێرا ئەوویتریان نووسراوە **SLOW** واتە لەسەرخۆ ئێمەش بۆخێرابوونی کۆمپیوتەرەکەمان هێڵەکـە بۆلای چەپ دێنین واتـە بۆلای(**FAST**واتا خێرا .ئینجا) (**APLLY** واتـا جێبەجێکـردن) کلیـک دەکەیـن دەبینیـن کـە کۆمپیوتەرەکەمـان زۆر لەجـاران خێراتربـووە بەم شـێوەیە، وێنەی (٥).



وێنەی (٤)



وێنەی (٥)

# چۆنیەتی دامەزراندنی ویندۆز (xp)

**ئامادە کردنی: نیکار صابر بلباس**

زۆر گرنگە بزانین چۆن کۆمپیوتەرەکەمان لە بایۆسی (BIOS) ەوە بە (CD ROM ) ە کە بخەینە گەر:

١. سەرەتا پێش هەموو شتێک ئەبێت ئەو ویندۆزەی (XP) یەی کە لە بەر دەستتدایە مەرجە (BOOTABLE) بێت .

٢. (CD) ویندۆز بخەرە شوێن ( CD ) کەتەوە کۆمپیوتەرەکەت سەر لە نوێ دابگیرسێنەوە کاتێک کە دەکوژێتەوە لە کاتی داگیرساندنەوەدا ئەبێت پەنجەت لە سەر کلیلی ( DELETE ) یان ( F2 ) دابنێ بە پێی جۆری (BIOS) ە کە پاشان ئەم پەنجەرەیەت




بۆ دەکرێتەوە .

٣. تۆ دووەم دانە هەڵبژێرە دوایی ئەم لیستەت بۆ دەکرێتەوە.




یەکەم دانە ئەکەیت بە (CD) دووەم دانە ئەکەیت بە HDD. بەڵام دووەمیان مەرج نییە لە هەموو بایوسێک HDD. بێت بەڵام تۆ لە هەموو بارێکدا دووەم بکە بە هاردەکەت .

٤. دوای ئەو کارانەی کە کردوومانە ئەبێت پاشەکەوتی بکەین تۆش لە سەر کیبوردەکە پەنجە بنێ بە کلیکی F10 یا خود وەک ئەم وێنەیە بکە .

لەم کاتەدا کۆمپیوتەرەکە دادەگیرسێتەوە ئێستا کۆمپیوتەرەکە




لە ( CD ) ەوە ئەکەوێتە کار ئەم پەیامە نیشان ئەدات .

تۆش لە سەر کیبۆردەکە پەنجە بنێ بە هەر کلیلێکدا بەردەوام




ئەبێت و ویندۆز دەست دەکات بە دامەزراندن.

٥.دوای ئەوە ئەم ٣ پرسیارە دێتە پێشی :

١ - TO SET UP WINDOWS XP NOW . PRESS ENTER .

ئێستا بۆ دابەزاندنی ویندۆزی ئێکس پیت پەنجە بنێ بە کلیلی ئینتەر .

٢ - TO REPAIR A WINDOWS INSTALLATION USING RECOVERY CONSOLE PRESS R.

ئەگەر ویندۆزی ئێکس پیت هەیە و کێشەکەت لەگەڵ سیستەمەکەتدا هەی ئەوا ئەتوانیت سەر لە نوێ ویندوز بگەڕێنیتەوە یا خود چاکیبکەیتەوە ئەویش بە پەنجەتان بە کلیلە (R) .

٣ - TO QUIT SET UP WITHOUT INSTALING WINDOWS XP PRESS F3

ئەمەشیان بۆ دەرچوون و رازی نەبوون بۆ دامەزراندنی ویندۆزەکە پەنجە دەنێیت بە کلیلی (F3) .




ئێستا ئێمە ئەگەر بمانەوێت ویندۆز لە سەرە تاوە دابمەزرێنین ئینتەر دەکەین .

٦. ئێستا پرسیارمان لێدەکات کە ئایا هاردەکەمان پارچە بکەین یان هەموو جێگا بدەین بە درایڤی (C:)

و ئەگەر بمانەوێت لە سەر کۆمپیوتەرەکەمان (C: و D:) هەبێت بۆ نمونە ئەوا دەتوانیت کلیلی (C) داگرین .

بۆ دروست کردنی پارچەکانمان وێنەی هاردێکی پاک بەم شێوەیە یە تۆش هەموو فەرمانەکان جێ بەجێ بکە لە سەرەوە نووسراوە .



٧. کە ئەمە جێبەجێ کرا دوای ئەوە پرسیارمان لێدەکات بە چ فۆرماتێک ویندۆزەکە دابەزێنین وەک لەم وێنەیەدا دیارە



. دیارە دوو جۆرە فۆرمات نیشاندراوە (خێرا) و ( خاو ) NTFS FILE SYSTEM ئەمەیان بە رای من زۆر باشە لە بەر ئەوەی ( SECURITY ) باشی تیدایە وە بۆ هەلبژاردنی ئەم فۆرماتە پەنجە بنێ بە کلیلی ئینتەر .

٨. دوای ئەوە خۆی دەست ئەکات بە دامەزراندن و کۆپیکردنی فایلەکانی سیستمەکە .

لێرەدا کۆمپیوتەرەکە خۆی ریستارت ئەکاتەوە بەم شێوەیە




دوای ئەوە ئینجا ویندۆز بە تەواوەتی دائەمەزرێت .




لێرەشدا فەرمانەکان هەر خۆی ئەیکات پێویستی بە تۆ نییە .
دوای ئەوە ئەم پەنجەرەیە دەکرێتەوە .



ئینجا (NEXT) داگرە .




لە یەکەم ناوی خۆت ئەنووسیت یان هەر ناوێکی تر بێت . دووەم ناوی کۆمپانیا یـان پەیوەندی کارکردنت لەگەل هەر شوێنێک ناوەکەی بنووسە .
ئینجا (NEXT) داگرە .




لێرەدا ئەگەر ویندۆزەکەی تۆ ئەم لاپەرەیەی هاتەســەر دیار ئەبێـت لەو خانانەدا تۆ ژمارەی نهێنیەکەی بنووســیت . دوای ئەوە (NEXT) داگرە .




ئـەوەی کـە هێڵـە سـورەکەی بـە دواوە هاتـووە نـاوی کۆمپیوتەرەکەیـە تـۆ لێـرەدا ئەبێت ناوێک بـۆ کۆمپیوتەرەکە دابنێیت وە ئەگەر بتەوێت لە خوارەوەش پاسورد دائەنێیت .
دوای ئەوە (NEXT) داگرە .




ئـەم پەرەیە تایبەتە بە ڕێکـەوت و کات لە ( TIME ZONE ) تۆ لە هەر وڵاتێ: ئەژیت پێویستە ئەو وڵاتە هەڵبژێریت دوای ئەوە ( NEXT ) داگرە .




لێرەدا ئەگەر (LAN CARD) لە سەر کۆمپیوتەرەکەت هەبێت و رەنگە زۆر جار ویندۆزی (XP) وەگەرخەر بۆ ئەو (LAN CARD) بدۆزێتـەوە ئەگـەر (LAN CARD) ت نەبێت تـۆ ئەم پەنجەرەیە نابینێـت وە ئەگـەر بەم شـێوەیە بـوو وێنەکە تـۆ (TYPICAL SETTINGS) هەڵبژێرە و ئینجا (NEXT) داگرە .




لە دوای ئەمە ویندوز بە تەواوەتی دائەمەزرێت بە بێ کێشـە و کۆمپیوتەرەکە خوی دەستپی ئەکاتەوە .

# پزیشکان و مەودای بەکارهێنانیان بۆ کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت

بێگومان وەک دیارە بواری پزیشکی لەم سەردەمەی ئێستاو پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا بوارێکی زۆری پێشکەوتنی بەخۆیەوە دیوە لەوولاتە پێشکەوتوەکان کەئێستا زۆربەی پشت بەستنە کان بۆزانیاری و توێژینەوەکان لەڕێگایی کۆمپیوتەر و ئەنتەر نێتەوەیە، دەتوانین بڵێین ئەنتەر نێت سەرچاوەیەکی باشی زانستیە بۆ زۆربەی بوارەکان بەتایبەتی بواری پزیشکی. ئایا پزیشکانی ئێمەی کورد تاچەند ئاشنان بەم ئامێرە پێشکەووتوە ؟ تاچەند ڕۆژانە لەکارەکانیان پشت بەم ئامێرە دەبەستن ؟ ئایالەلایەنی زانستی چ سودێکیان لی وەرگرتووە ؟ هیچ کار ئاسانیەکی بۆ کردوون ؟ بۆ زانین لە بارەی ئەم بابەتە چەند پزیشک و کارمەندێکمان هێنا دوان.

**ڕیپۆرتاژ: ڕێناز ئەردەلان بەکر**
**فۆتۆ: هێرش ئیسماعیل**



**دکتۆر دلاوەر عمر کۆیی**

**د.نەشتەرگەری گورچیلە لەنەخۆشخانەی ڕزگاری بەم شێوەیە بۆچوونی خۆیی دەربڕی:**

بواری کۆمپیوتەرو ئەنتەر نێت یەکێکە لە هەرە تەکنەلۆژیایی پێشکەوتوو لەسەرتاسەری جیهان، کەوایی کردووە جیهان بچووک بێتەوە . لە کوردستانیش تارادەیەک بڵاوە، بەلام ئێمەی پزیشکان کەئەم بوارە بۆ ئێمە زۆرگرنگ و پێویستە ئەگەر بەشێوەیەکی زۆر پێشکەوت و هەبێ لەنەخۆشخانەکان. ئەوەی ئێستاش دابین کراوە جێگایی سوپاسی وەزارەتی تەندروستیە بەلام بەگوێرەی پێویست نیە، لەبەر ئەوەی هێلەکان زۆر لەسەرخۆن سستن لەکار کردن ژمارەیان کەمە، ئێستا لە میانەی ئەم چاوپێکەوتنە ئەنتەرنێتەکەمان کارناکات . هەموو ئەم هۆیانە وایی کردوە ئێمە سست بین نەتوانین بەکاری بهێنین بۆیە گەر بێت و زیاتر پەرەی پێ بدرێ هێڵەکانیش زیاد بکرێ،وەداواکارین خولێک بکرێتەوە هەموو پسپۆڕان تێیدا بەژداربن بەبێ جیاوازی واتا بەئارەزوویی کەسەکان بێت ئەوەی دەیەوێ سودی لی وەر بگرێ یاخوود لە قاوەخانەکانی ئەنتەر نێت شوێنمان بۆ دابین بکرێ بۆئەوەی زانیاری پزیشکی لەڕێگایی ئەنتەر نێتەوە وەر بگرین. بەلام تاوەکو ئێستا شتێکی وا نەکراوە چونکە ئێمە لێرە کە کتێب خانەمان هەیە سەر چاوەکانی کەمن . بۆیە ئێستا ئێمە چاوەڕوانین و داوادەکەین دوایی ئەو گۆڕانکاریەی کەبەسەر عێراق هاتووە ئەو بارەی ئێستا کە کوردستان تێدایە زیاتر ئاور لە پزیشکان بدرێتەوە،لە بڵاو کراوە و ڕۆژنامەکان هەر تەنیا باسی سلبیاتی پزیشکان نەکرێت بەڵکو کارێکی وا بۆ پزیشکان بکەن کەئەوانیش بتوانن زیاتر خزمەتی میللەتەکەی خۆیان بکات .

**هەروەها بەڕێز فوئاد عبدلرحمان ڕەشید بەرپرسی بەشی ئەنتەر نێت لە نەخۆشخانەی ڕزگاری گووتی:**

بەشی ئەنتەرنێت و کۆمپیوتەر بەشێکی زۆر پێویست و گرنگە، لەبەر ئەوەی زۆربەی گورانکاریەکانی جیهان بەشێکی هەرە زۆری ئەنتەرنێتی داگیر کردوە . بەشی ئەنتەرنێت کەلە نەخۆشخانەی



ڕزگاری داندراوە تەنیا بۆ پزیشکی پسپۆڕە تەنیا هەفتەی ڕۆژێک بۆ قوتابیانی خوێندنی باڵا تەرخان کراوە دکتۆرەکان تارادەیەک توانیویانە سود وەرگرن بەلام هەندێک کەم و کورتی هەیە لەوانە هێڵی ئەنتەر نێتەکە وەک پێویست نیە هێڵەکان ژمارەیان کەمە، ئێستا ئێمە دوو جیهازمان هەیە زۆر جار هەیە دکتۆرەکان سرە دەگرن بۆ بەکارهێنانی ئەنتەر نێت هێڵەکان زۆرسستن، سەرەڕایی ئەوەش ڕۆژێک هەیە دوو ڕۆژ نیە. بۆیە لەبەر ئەم هویانە بەشێوەیەکی فراوان سوودی لێ وەرناگیرێ وەسەرچاوەزانیاریەکان کەمن، زۆربەی دکتۆران لەسەرچاوەزانیاریەکان دەگەرێن بۆ ئەوەی ئەو زانیاریەی کە هەیانە پەرەی پێ بدەن زیادی بکەن بەلام لەگەل ئەم هویانەش هەندیک کار ئاسانی کردووە بو نمونە سەرچاوەکانی جاران هەمووی هەر کتیب بوو کە بە دەساڵ جارێک کتێبی نوی دەهات بەلام ئێستا دەتوانی

لەڕێگایی ئەنتەر نێتەوە بۆ ماوەیەکی کەم نوێترین زانیاری دەست بکەوێ. ئێمەش لێرە هەندێک سەرچاوەی زانستیمان هەیە کە سودی لێ وەردەگیرێ بەڵام لە بەر ئەوەی سیستەمی (ماستەر کارتمان) نیە بۆیە زۆر جار هەندێک لە دکتوران بە پارە هەندێک سەرچاوە زانستی تر هەیە کەلای ئێمە نیە بەکاری دەهێنن بۆ لایەنی زانستی سودی لێ وەردەگرن .



**بەڕێز سەرباز حمد کارمەندی نەخۆشخانەی ڕزگاری لەبەشی نەشتەرگەری بەپێیی ووتەکانی خۆیی دەڵێ :**

لە رووی ئیش و کارەکانمان بە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر کار ئاسانیەکی زۆری بۆ کردووین، کەمن لەم بەشە لەسەر ئامێری کۆ مپیوتەر کاردەکەم. کارەکەشم نوسینەوەی ناو و تەمەن و رەگەز و جۆری خوێن و جۆری نەشتەرگەری نەخۆشەکانەکەلەناو کۆمپیوتەر هەڵدەگیرێ کە پێشتر بە دەست دەمان نووسیەوە کە ئەمەش سودێکی زۆری هەیە، بۆنمونە کاتێک دکتور دەیەوێ ئامارێک بۆ نەخۆشەکانی خۆیی بکات چەند نەخۆشی چارەسەر کردووە، یاخود ئەوانەی بەجیهاز کردوویەتی ئەوانەی بەبێ جیهاز کردوویەتی بو نمونە ئێستا کولستون بە ئامێر دەکرێ کە ئەمەش وایی کردووە کارەکانمان بەرێک و پێکی بڕوات .



## دکتۆرە نورا علی عبدلرحمان

**پزیشکی خولاو لەنەخۆشخانەی ڕزگاری**

**بەم جۆرە هاتە دوان :**

پێویستە لە هەموو نەخۆشخانەکان هێڵی ئەنتەر نێت و کۆمپیوتەر هەبێت چونکە زۆر گرنگە. بۆ نمونە ئێمەی پزیشکانی خولاو لەکاتی ئێشکگری گەر نەخۆش و کارمان زۆرنەبێ، دەتوانین ئەو کاتە بەئەنتەر نێت بەسەر بەرین بۆ ئەوەی لەپێشکەوتووترین ونوێترین زانیاری پزیشکی ئاگاداربین. من لە ماڵەوە خۆم فێر دەکەم لە کولیژیش ڕۆژێک دابین کرابوو بۆ کارکردن لەسەر هێڵی ئەنتەر نێت، زیاتریش لەکاتی پێویست دەچووین بۆ قاوەخانەکانی دەرەوە بۆ یە داواکارین خولێک بکرێتەوە بۆئەوەی سودی لێ وەربگرین .

## دکتۆر ئاری نازم

**پزیشکی نیشتەجێیی خولاو لەنەخۆشخانەی هەولێری فێرکاری دەڵێت:**



ئامێری کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت هەموویی چەند ساڵێکەبەشێوەیەکی فراوان هاتۆتە کوردستان، کە پێشکەوتنێکی زۆری بەدی کرد لەژیانی زانستی بۆ پزیشکان. ئێمە کاتێک لە کۆلیژ بووین زوربەی بابەتەکانی پزیشکیمان لەئەنتەر نێتەوە وەردەگرت یاخود کاتێک کۆرو سیمینارمان دەگێڕا پشتمان بەئەنتەر نێتەوە دەبەست،کە ئەو کات وەک ئێستا نەبوو زۆر بەکەمی بەکاردەهات تەنیا سەنتەر هەبوو خەڵک رویی تێ بکات بەڵام ئێستا بە شێوەیەکی بەرفراوان بەربڵاوە تەنانەت زۆربەی دکتۆران لەماڵەوە هەیانە. وەزارەتی تەندروستی هەوڵی داوە بەدامەزراندنی ئەنتەر نێت لەزۆربەی نەخۆشخانەکان لەوانە نەخۆشخانەی ڕزگاری بەڵام ئێمە لەکاتی دەوام ناتوانین زۆر بەکاری بهێنین،ئەگەر لەدوایی دەوام ئەویش ئەوەی زیاتر لە ماڵەوە هەیبێ دەتوانێ سودی لێ وەربگرێ ئەوەشی نیەتی لەکۆلیژ بنکەیەکی گەورە ی کۆمپیوتەرو ئەنتەر نێت هەیە دەتوانێ بەکاری بهێنێ



## دکتۆر دلێر رەحمان

**پزیشکی نیشتەجێیی خولاو لەنەخۆشخانەی هەولێری فێرکاری بەم شێوەیە تیشکی خستە سەرووتەکانی:**

سەبارەت بە کومپیوتەرو ئەنتەر نیت پیمان باشە خولیک بو بوهەموو دکتورەکان بکریتەوە بەگشتی، چونکە راستە ئیمە لە ئەنتەرنیت دەزانین بەلام

ئەوەی دەیزانین زۆر سادەو ساکارە لەوانەیە ئێمە کاتێک ئەنتەر نێت بەکار دەهێنین بۆکارێکی سادەو تایبەتی بێت. جا ئەگەر خولێک بکرێتەوە کاریگەری نەبێ لەسەر دەوام بۆئەوەی زیاتر لەلایەنە زانستیەکەی سودی لێ وەربگرین. بۆ ئێمەی پزیشکان ئەنتەرنێت سودێکی گەلێک زۆری هەیە،بۆنموونە بۆ زانینی زانستی نوێ پزیشکی لەوولاتانی دەرەوە چیە؟ یاخود هەر لەڕێگایی ئەنتەر نێتەوە زانیاریمان هەبێ کە زانکۆکانی پزیشکی دەرەوە چی دەخوێنن؟ زانستی ئەوان چۆنە هی ئێمە چۆنە؟ یاخود بتوانین لەلایەنی نەشتەرگەری سودیان لی وەرگرین، یان ئەو پزیشکانەی وەک ئێمەن واتا پزیشکی خولاون لەوێ چۆن کاردەکەن کارەکانیان چین؟ زۆر جار هەندێک لە دەرمان هەیە ئێمە نازانین چیە تەنیا ناوەکەی دەزانین کە ئەویش لە پسپۆران گوێمان لێ بووە

بەڵام بەهۆیی ئەنتەرنێتەوە دەتوانین زانیاری زیاتر وەربگرین لەبارەی ئەم بابەتانە. ئێمە ئێستا لە نەخۆشخانەی فێرکاری لە خانەی پزیشکان کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێتمان نیە. لەکۆلێژیش سەنتەرێک هەیە بەلام تەنیا بۆ کۆلێژە پەیوەندی بە پزیشکی خولاو نیە تەنیا ئەگەر بتناسن ئەو کات بۆت هەیە بەکاری بهێنی،بۆیە دووبارە داواکارین کەخولێک بکرێتەوە بەگشتی بۆ پزیشکان نەک تەنیا بۆ فێربونی ئەنتەرنێت بەلکو فێرمان بکەن چۆن سود لە ئەنتەر نێت وەربگرین .



**دکتۆر هونەر عبدلرحمان**

**لەبەشی شکان لەنەخۆشخانەی هەولێری**

**فێرکاری ووتی :**

بێگومان سوودی ئەنتەرنێت زۆرە بۆ ئێمەی پزیشکان چونکە ڕۆژ بەڕۆژ زانستی نوێ پەیدا دەبێت لەلایەنی پزیشکیەوە، کە ئەگەر بێت و ئەم سەرچاوەو زانیاریانە بە کتێب بێت درەنگ بە دەستمان دەگات بەڵام بە ئەنتەرنێت،بە ماوەیەکی کەم و دەتوانی ڕۆژ بەڕۆژ دواین پێشکەوتنە زانیاریە پزیشکەکان بزانین. یان لە لایەنی شێوازی خوێندنی زانکۆکانی دەرەوە یاخود بۆ لایەنی تاقی کردنەوە بۆ ئەو نەخۆشیانەی کە چارەسەری نیە نوێترین لێکۆڵینەوە لەبارەیان داواکارین هۆلێکی کۆمپیوتەرو ئەنتەر نێت دابین بکرێ بەڵام بەگشتی بێت بۆ هەموو پزیشکان نەک بۆ تایبەتی بەکاربێت.

# ئاگاداری

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە توانای نووسینیان هەیە لە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت ئەگەر توانای نووسینی بابەتیان هەیە لەم بوارەدا دەتوانن بەشداری بکەن لە گۆڤاری کۆمپیوتەر و دەتوانن سەردانمان بکەن یان بابەتەکانیان بنێرن بۆ ئەم ناونیشانە : هەرێمی کوردستانی عێراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری جادەی شەست مەتری نزیک هۆڵی زەرد یان پەیوەندی بکەن بە سەرنووسەرەوە بەم ناونیشانە مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس هەولێر بەرامبەر قەلا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم یان بە ژمارە تەلەفۆنی 2232721 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی

EMAIL : COMPUTER_MAGAZINE_2005@YAHOO.COM

EMAIL : ARAS_CO_CENTER@YAHOO.COM

تێبینی :

*هەر بابەتێک بلاو بکرێتەوە پاداشتی پێ دەدرێت .

* هەر بابەتێک لە شوێنێک یان گۆڤارێکی تری کوردی بلاوکرابێتەوە ئێمە بلاوی ناکەینەوە.

* بابەتەکانتان ئەگەر نەشیا بۆ بلاوکردنەوە ئەوا ناگەرێتەوە.

*هەر کەسێک بابەت ئەنێری بۆ بلاو کردنەوە با بابەتەکەی لەسەر فلۆپی دیسک یان فلاش میموری بێت و وێنەی ڕوونکەرەوەکان بەجیا لە نێو فولدەرێک دا بێت و بابەتەکەی بە بەرنامەی MICROSOFT WORD بنووسێت.

* هەر کەسێک بابەتی وەگێران ئەنێری با ئاماژە بکات بەسەرچاوەکەی.

# چۆنێتی خێرا کردنی پەیوەندی ئەنتەرنێت بۆ ١١٥ کیلو بایت لە چرکەیەکدا

ئا: ئاراز مەولود

ئەم هەنگاوانە بۆ خێراکردنی پەیوەندی ئەنتەرنێت تایبەتن بەو کەسانەی کە پەیوەندیەکانیان لە ڕێگای دایل ئەپەوەیە و تاقیکراوەتەوە و پێویستیت بە هیچ بەرنامەیەک نابێت بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە .

سەرەتا یەک جار کلیکی لای ڕاست بکە لەسەر ئایکۆنەی MY COMPUTER دوای ئەوە بچۆرە سەر فەرمانی PROPERTIES و یەک جار کلیکی لای چەپی لەسەر بکە شێوەیەکت بۆ دەردەکەوێت لەو شێوەیەدا بچۆرە سەر فەرمانی HARDWARE و لەوێش یەک جار کلیکی لای چەپ بکە دواتر بچۆرە سەر فەرمانی DEVICE MANAGER بڕوانە وێنەی ژمارە (١).

دواتر لیستێکت بۆ دەردەکەوێت لەو لیستەدا بچۆرە سەر بەشی MODEMS دوای ئەوە یەک جار کلیکی لای ڕاست لەسەر MODEMS پێناسە کراوەکە بکە لیستێکی ترت بۆ دەردەکەوی ئنجا کلیکی لای چەپ لەسەر فەرمانی PROPERTIES بکە و بچۆرە سەر بەشی ADVANCED بچۆرە سەر بۆشایی EXTRA SETTING ئنجا لە ناو ئەو بۆشاییەدا ئەم ووشەیە وەکوو خۆی بنووسە AT&FX دواتر کلیک بکە لەسەر فەرمانی موافق بڕوانە وێنەی ژمارە ( ٢ ) دوای ئەوە ئامێرەکەت ریستارت بکەوە دوای پێ بوونەوەی کۆمپیوتەرەکە پەیوەندی بکە بە ئەنتەرنێتەوە واتا هێڵەکە کۆنێکت بکە و چاوەڕوان بە تا ئەو کاتەی کە هێڵی ئەنتەرنێت دێتە ناو ئامێری کۆمپیوتەرەکەت ئنجا دەبینی لە ژێرەوەی شاشەکە لەسەر شریتی مەهام زانیاری هێڵەکەت نیشان دەدات کە ١١٥ کیلۆ بایتە لە چرکەیەکدا هەروەها لە کاتی ڕوانین لە سایتەکان هەست بە خێرا بوونی هێڵەکە دەکەیت بڕوانە وێنەی ژمارە (٣).



وێنەی ژمارە-١



وێنەی ژمارە-٢




وێنەی ژمارە-٣



# پێناسەیەکی ئاخاوتن و گفتوگۆ (chat)

ئا: شیماء حسام الدین

زۆربەی تازە دەست پێکەران و فێربووانی ئەنتەرنێت گوێ بیستی ئەم خزمەتگوزاریە بەناوبانگە بوونە، کەئەویش ئاخاوتن و گفت گۆی زیندووە. بگرە زۆر کەس هەن کەتەنها ئەم خزمەتگوزاریە ئەزانن لە ئنتەرنێت. وە ئاموژگاری ئیمە بۆ تۆ ئەوەیە کە هەول بدەی سوود لە گشت خزمەتگوزاریەکانی ئەنتەرنێت وەربگریت و خۆت مەبەستەوە تەنها بەکارکردن لەسەر یەک بواری ئنتەرنێت. ئاخاوتن و گفتوگو بریتی یە لە وەرگێرانی ووشەی (CHAT ) بەزمانی ئینگلیزی. وە لە وەتەی بوونی ئنتەرنێتەوە ئەم خزمەتگوزاری بلاوبوونەوەیەکی بەرفراوانی بەخووە بینیووە لەنیوان بەکارهێنەرانی ئەم تورە· بە جۆرێک ئەتوانی لەم خزمەتگوزاریەدا گفتوگو لەگەل هەر کەسیک بکەیت لە هەر شوینیکی جیهاندا بیت بەمەرجیک توو ئەویش پەیوەندیتان هەبیت بەتوری ئەنتەرنیتەوە. بەلام چۆن ؟ بەشیوەیەکی سادە دابەش دەکریت بەسەر دوو رێگا:

رێگای یەکەم: بەکارهێنانی بەرنامەی تایبەت بەکارکردنی هەندیکیان بەخۆاریی یە و هەندیکی تر بەخۆرایی نی یە و ئەبێ ئەو بەرنامەیە بکرێت.

رێگای دووەم : گفتوگو کردن لە رێگای روانین لە ناوچەی تایبەت بۆ ئەم مەبەستە.




**وەرێگای یەکەم بەم شێوەیەیە:**

بەرناماکانی گفتوگو : لەم رێگایەدا مەرجە کە بەرنامەی گفتوگو لە ئامیری هەردوو کەسەکەدا هەبێت، وەکو بەرنامەکانی پالتاک یان یاهو ماسنجەر یان ئای سی کیو، وەلەهامان کاتدا هەردوولایەن پەیوەندی دار بن بە ئنتەرنێتەوە.

وە زۆر لەبەرنامەکاندا ئەم خزمەتگوزاریە پیش کەش ئەکەن و بەملیۆنەها کەس تیایدا بەشداری ئەکەن. بەرنامەکانی گفتوگۆ ئەکرین بە دوو بەشەوە:

١-بەرنامەی گفتوگوی لاسایی:-

ئەم بەشە پشت دەبەستیت بە دەرکەوتنی شاشە وەک شاشەی روانین کە دەتواندری زیاتر لە کەسیک تیایدا گفتوگو بکات. وەئەتوانی

گفتوگۆ لەگەڵ کەسێکی دیاری کراودا بکەیت بێ ئەوەی ئەوی تریان بزانێت کەچی ئەگوترێت لەنێوانتاندا. وەلە بەناو بانگترین بەرنامەکانی بەرنامەی (MIRC).

٢-سایتەکانی گفتوگۆ ئەمەش لە بەناوبانگترین بەرنامەکانی کاتی ئێستایە. وەپشت دەبەستێت بەردەرکەوتنی لیستێکی بچووک لە شاشەی ئامێرەکەت کە هاوڕێ و هەڤاڵەکانتی لە خۆوە گرتووە (پێویستە ناو و ژمارەکانیان بزانیت بۆ ئەوەی بیان خەیتە لیستی تایبەت) وەئەتوانی لەم بەرنامەیەدا نامەیەک رەوانەبکەیت بۆکەسێکی کە لەو کاتە ئنتەرنێت بەکار ناهێنی و وەری ئەگرێت لەکاتی چوونە ناو ئنتەرنێت و بەکارهێنانی ئەم بەرنامەیە. وە لە هەندێک بەرنامەدا ئەتوانی دۆسیە بگۆریتەوە لەنێوان تۆ و ئەو کەسەی گفتوگۆی لەگەڵدا ئەکەیت. (ئاگاداری ئەوەبە پێشوازی لەهیچ دۆسیەیەک نەکەیت کەلەسەرچاوەیەکی نادیار یاخود گومان لێ کراو هاتبێت).

**شوێن و جێگاکانی گفتوگۆ:**

ئەم ڕێگایە زۆربەی کەس ئارەزووی ئەکات بەتایبەتی بەکارهێنەرانی ئامێرەکانی گشتی. وەپشت دەبەستێت لەسەر بەکارهێنانی ڕوانین وەدەبی پەیوندی دار بیت بە ئنتەرنێتەوە وەئەم خزمەتگوزاریە بەشێکی زۆر لە سایتە بیانی و بەشێک لە سایتەعەرەبی پێشکەشی ئەکات٠ وەئەم ڕێگایە بەچاکتر ئەژمێردرێت لەڕێگای دووەم چونکە هەندێک ناوچەی تیایدا هەیە کە میوانداری و گفتوگۆی پسپۆری تیایدا ئەکرێت لەهەندێ بواردا بۆ نمونە لە بواری (پزیشکی و تەندروستی) وەڕێگا بەمیوانداران ئەدات بو گفتوگۆ کردن ٠

وەلە سایتەبەسوودەکانی کە ئەم خزمەتگوزاریە پیشکەش ئەکات سایتی:
CHAT . YAHOO . COM. WWW.CNN.COM

وەلە سایتە بەناوبانگەکانی عەرەبی (سایتی گۆرەپانی عەرەبی) و ناونیشانەکەی ئەمەیە:
WWW.ACSAHA.COM

# چەتەکانی ئەنتەرنێت دەست درێژیان کردە سەر بانکی ناوەندی سویسری

**وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: فلۆرا عەلی**



زیورخ : چەند چەتەیەکی ئەنتەرنیت توانیان فێل لە بانکی ناوەندی سویسری بکەن، کە سایتێکی هاوشێوەی سایتی دەستەی ناوەندی دارایی یان دروست کردبوو .

وتەبێژ بەناوی بانک (ورند ئەبینج) گووتی ئەم کارە کە پێش سالێک ڕوویدا، زۆر درێژەی نەکێشا .

رۆژنامەی (لالیبتریەی سویسری ) ئەم هەواڵەی پشت راست کردەوە، کە دەڵی ئەم سایتە چاولیکەرەوەو هاوشیوەی سایتی بانکی ناوەندی بوو بۆ بە دەست هێنانی ناونیشانی ئەلیکترۆنی . ئەم چەتانەی ئەنترنێت ئیمیلیان بۆ خەڵک دەنارد بەوەی کە دەتوانن قازانج دروست بکەن بە بری (٤٠) ملیۆن فرەنکی سویسری کە دەکاتە (١٦)ملیۆن یۆرۆ لە بەرامبەر پێدانی بری (١٠٠٠) هەزار فرەنک پێش وەختە .

( ئەبیج) گووتی پاش دەست تیوەردانی پۆلیسی سویسری و ئەمریکی بە چەند سەعاتیک ئەم سایتە داخرا.

سەرچاوە: موقع عیون

# بینینی پاسۆرد
# SHOW PASS

وینه‌ی (١)

ئا: ئارام قادر

ئه‌م به‌رنامه‌یه تایبه‌ته به شکاندنی کۆدی نادیار واتا تۆده‌ته‌وێ کۆدی به‌رنامه‌یه‌ک بزانی یاخود کۆدی ئیمێلیک بزانی که‌کۆده‌که به‌شێوه‌ی ئه‌ستێره‌دیاره واتا ژماره‌نییه تۆده‌توانی له‌رێگای ئه‌وبه‌رنامه‌یه‌وه ده‌توانی کۆده‌که دیاریبکه‌ی.

## چۆنیه‌تی به‌کارهێنانی ئه‌وبه‌رنامه

له‌سه‌ر رووی به‌رنامه‌که چه‌ند شتێک نووسراوه وه‌ک DIALUPS CACHEDS PICK تۆته‌نها ئیشت به PICK ده‌بێت، وینه (١).

به‌رنامه‌که ده‌که‌یته‌وه ده‌چیته سه‌رئه‌وکوده‌ی که‌پێوستته بزانی چه‌نده کلیک له‌سه‌ر کوده‌که ده‌که‌یت و پاشان PICK لیده‌ده‌یت دووباره کلیک له‌سه‌ر کوده‌که‌ده‌که‌یت به‌م شیودیه، وینه (٢).

ده‌بینیت کوده‌که دیته ناو ئه‌وبه‌رنامه‌یه دیارده‌که‌ویت به‌ژماره.




وینه‌ی (٢)

# Microsoft Visual Studio .Net

نووسینی:
عبدالقادر نوری سعید




وێنەی ژمارە (١)



وێنەی ژمارە (٢)

ناوەندی کارکردنی دۆت نێت پێگەیەکی نوێیە بۆ داهێنان و بەرەوپێش بردنی پرۆگرامەکان و ماڵپەری وێب، ناوەندێکە کە تایبەت نییە بە تاکە زمانێکی پرۆگرامکردن، بەڵکو ئەتوانرێت بە بەکارهێنانی هەریەکێک لە زمانەکانی پرۆگرامکردن وەک VISUAL BASIC .NET زمانی C# .NET یان زمانی VISUAL C++ .NET یان هەر زمانێکی تر کە ئاسوودەبێ لەگەڵ ناوەندی دۆت نێت پرۆگرام و ماڵپەری وێب دروست بکرێت.

لە ڕۆژانی ئەمڕۆدا ٢٤ زمان ئاسوودەن لە گەڵ ئەم ناوەندەدا ئەتوانرێت هەریەک لەم زمانانە بەکاربهێنرێت بۆ پرۆگرامکردن ونووسینەوەی کۆدەکان، **وێنەی ژمارە (١)**

**خشتەی (١) ناوی هەندێ لەو زمانانەی**
**کە لە ناوەندی دۆت نێت کاردەکەن**

| زمان | زمان |
|---|---|
| Jscript | C# .Net |
| Mercury | Visual Basic .Net |
| Oberon | Visual C++ .Net |
| Pascal | APL |
| Perl | COBOL |
| Python | Component Pscal |
| RPG | Curriculum |
| Scheme | Eiffel |
| Smalltalk | Fortran |
| Standard ML | Haskell |
| .... | Java |

DOT NET FRAMEWORK چییە؟

DOT NET FRAMEWORK چوارچێوەی کارکردنی دوت نێت بە دلی فیژواڵ ستودیو دوت نێت ناوە دەبرێت و لە دوو پێکهاتە پێک دێت:

١-پێکهاتەی COMMON LANGUAGE RUNTIME CLR:

لە بەشە هەرەگرنگەکانی ناوندی دۆت نێتە، ئەو پرۆگرامە نووسراوەکان جێبەجێ دەکات، هەڵدەستێ بە گۆڕینی پرۆگرامە نووسراوەکان بۆ MICROSOFT INTERMEDIATE LANGUAGE (MSIL) کە ڕێنماییەکان بۆ CLR پێناسە دەکات ئنجا کۆمپایلەرێکی تر لە ناو CLR هەڵدەستێ کۆدەکە لە MSIL ئەگۆڕێت بۆ MACHINE CODE.

ئەو کۆدەی کە لەژێر ناوەندی دۆت نێت دا جێبەجێ دەکرێت پێی دەوترێت MANAGED CODE چونکە GARBAGE COLLECTOR کۆکەرەوەی پاشماوەکانی میمۆری بەکاردێنێت بۆ کۆکردنەوەی پاشماوەکان و پاکردنەوەی میمۆری.

٢-پێکهاتەی FRAMEWORK CLASS LIBRARY FCL:

بریتیە لە پەرتوکخانەی کلاسەکانی دۆت نێت DOT NET CLASSES LIBRARY کە ئەتوانرێت لەگەڵ هەر زمانێک لە زمانەکانی دۆت نێت بەکار بهێنرێت، زیاتر لە پێنج هەزار کلاسی تێدایە کە یارمەتی دروست کردنی پرۆگرام دەدات و ئاسانکاری بۆ دەکات، **وێنەی ژمارە (٢)**

هەر لەناو ناوەندی دۆت نێت دا ئەتوانی یەک زمان بەکاربێنی بۆ هەموو ئامانجەکان، بۆ نموونە ئەتوانیت بەرنامەکانی وێب WEB APPLICATIONS و بەرنامەکانی سێرڤەر/SERVER CLIENT APPLICATIONS بەیەک زمان بنووسیت بەبێ ئەوە پێویستت بە پرۆگرامکردن هەبێ بەزمانێکی تر.

لەم ناوەندەدا ئەتوانی ماڵپەری ئنتەرنێت بە فورماتی ASP.NET دروست بکەیت، هەروەها ئەتوانی خزمەتگوزاریەکانی وێب WEB SERVICES دروست بکەیت.

جگەلەوەدانانی پرۆگرامەکانی ئامێرەژیرەکانیش MOBILE&SMART APPLICATIONS بەکارهێنانێکی نوێیە لە ناو ناوەندی دوت نێتدا.

# بەرنامەی Google Earth

ئا: ڕێناز ئەردەلان

ئەم پرۆگرامە یەکێکە لەبەرهەمەکانی کومپانیای گوگل، بەکاردێت بۆ بینین و وێنەگرتنی سەر رووی زەوی لە ئاسمانەوە، بیرۆکەکەی ئەم پرۆگرامە زۆر سادەیە، بەهۆی ئاراستەکردنی نیشانەی ماوس بۆ ئەو شوێنەی سەر گۆی زەوی ئەتوانیت وێنەی لە رێگای مانگی دەستکرد وەربگریت و هەروەها ئەتوانیت وێنەکە زووم بکەیت و گەورەی بکەیت بۆ بینین ووردەکاریەکان، هەروەها ئاسانکاری ئەکات لە رێگەی گەران بەشوێن خاڵەکان و شوێنەکان و هێنانە سەر شاشەی بەبەکارهێنانی زانیاریەکانی هێڵی درێژی و پانی، توانای گەورەکردنی تائەو ئاستەیە کە ئەتوانیت سوود وەرگریت لەکاتی سەفەرکردن بۆ بینی ریگاکان و زانیاری لەسەر شوێنی مەبەست وەرگریت و تا ئەو ئاستەی باڵەخانەکان و هەروەها ئەتوانریت ئۆتۆمۆبیل لەسەر ریگا ببینریت هەروەها دەتوانریت لە ریگایەوە شارەکانی خۆتان ببینن بۆ نموونە ئەم وێنانە وێنەی شاری هەولێرو و پارکی هەولێرە کە لە هەمان جێگا وەرگیراوە، بروانە وێنە (١) و(٢).

ئەم پرۆگرامە بۆ بەکارهێنانی کەسی بێ پارەیەو هیچ تۆمارکردنێکی ناوێت، بەڵام ئەگەر ویستت بیگۆڕیت بۆ GOOGLE EARTH PLUS کە هەندێ خاسیەتی ترو کاریگەرتری هەیە ئەوکات ئەبێ بەشداری بەپارە بکەیت.



وێنەی (١)

سیفاتەکانی:

١- بەلاشە بۆ بەکارهێنانی کەسی.

٢- تەکنەلۆژیا زۆر پێشکەوتوو بەکاردێنێت بۆ گەیاندنی وێنەکان بە بینەر.

٣- پیشاندانی وێنەکان بە شێوەی 3D بۆ ئەم مەبەستەشە داتای ساتێلایت وئاریێلەکان بە تیرابایت ئەگوازێتەوەو بۆ پرۆسەکردنی وێنەکان بە ووردەکاریەکەی زۆر.

٤-بەکارهێنانی گەران SEARCH بۆ دۆزینەوەی شوێنە ناسراوەکان لە لای پرۆگرامەکە بە خێراییەکی زۆر.

ئەتوانریت لەم بوارانەی خوارەوە سوود لە وێنەکانی ئەم پرۆگرامە وەربگیریت:

- بۆ پلاندانانی سەفەر کردن.
- زانیاری کوکردنەوە لەسەر ئاراستەی رێگاو بان.
- بۆ دۆزینەوە خانوویک یان باڵەخانەیەک لە گەرەکێک یان لە شارێک.
- بۆ دۆزینەوەو دەستنیشان کردنی شوێنی پرۆژەکان.
- تەماشاکردنی رووخساری رووی گوی زەوی.

بۆ بەکارهێنانی ئەم بەرنامەیە سایتی EARTH.GOOGLE.COM بکەوە ئنجا پرۆگرامی GOOGLE EARTH FOR PERSONAL USE دابەزێنەو لەسەر کومپیوتەرکەت دابینێ.

بەکارهێنانی ئەم پروگرامە زۆر ئاسانە لە کاتی ئیشکردنی پروگرامەکە، شێوەی گوی زەوی دێتە سەر شاشە، بۆ گەران بە دوای شاری هەولێر لە خانەی SEARCH کە ئەکەوێتە لای دەستە چەپ لە چوارچێوەی پروگرامەکەدا بۆ عیراق بگەرێ و لە خانەکەدا بنووسە IRAQ ئنجا کلیک بکە لەسەر دوگمەی SEARCH دوای ئەوە یەکسەر ناوچەی عیراق دێنێتە سەر شاشە، بۆ گەورەکردنی هەر شوێنێک یان شارێک هەر جاری دوو کلیک بکە لەسەر ئەو شوێنە.



وێنەی (٢)

# پاراستنی پەڕەکانی وێب

ئا: شاخەوان عمر

وەکو لای هەمووومان ئاشکرایە مالپەڕەکانی وێب زۆرترین ڕووبەری ئەنتەرنێتیان داگیر کردووە وە زۆربەی بابەت و زانیاریەکانی لە ئەنتەرنێت بلاودەکرێنەوەی هەر لە ڕێگای تۆری جالجالۆکەی جیهانیە وە دەبێت چونکە تایبەتمەندی خۆی هەیە ئەویش بەیەک بەستنەوەی زانیاریەکانە لەگەل یەکتریدا زۆرێک لە ئێمە تائێستا نازانن چۆن پەڕەیەکی وێب خەزن بکەن بە جۆرێک تەواوی وێنەو بابەت و زانیاریەکانیش لە گەلی خەزن ببن یان کاتێک پەڕەیەکی وێب بۆ ماوەیەکی کاتی هەلیدەگرین و هەرکاتێک ویستمان ئەوا لینکەکانی لەسەر ئەنتەرنێت بەکار بێنین واتە پەڕەکە بەشێوەی ئەرشیف خەزن بکرێت. بۆ ئەم مەبەستە ئەم هەنگاوانە پەیڕەو بکە لە خەزن کردنی هەر پەڕەیەکی وێب دا:

دوای کردنەوەی مالپەڕەکە ئەگەر ویستت دانەیەکی ئەم پەڕە لەناو فلاش دیسکی خۆت یان فلۆپیەکەت هەلگریت ئەوا لە سەرەتادا دەچیتە سەر لیستی فایل لەوی (SAVE AS) هەلدەبژێریت وەکو لە وێنەی (١) ڕوونکراوەتەوە. دواتر چوارگۆشەیەک دێت داوات لێدەکات کە شوێنی فایلەکەت و ناوەکەی دیاری بکەیت لەگەل ئەوەشدا شێوازی خەزن کردنەکە دیاری بکە بڕوانەی وێنەی ژمارە (٢) ئەگەر یەکەمیانت هەلبژارد ئەوا پەڕەکە وەکو خۆی خەزن دەبێت، ئەگەر دووەمیان هەلبژێریت ئەوا لەسەر شێوەی ئەرشیف دەبێت و هەرجارێک ئەو فایلە لەسەر ئەنتەر نێت بکەیتەوە دەتوانیت بچیتە ناو پەڕەکانی تریەوە ئەمەش سودی دەبێت بۆ هەلگرتنی ئەو مالپەڕانەی کە ڕۆژانە یان زوو زوو دەیانکەیتەوە چونکە کاتێکی باشت بۆ دەگەڕێنیتەوە، سێیەمیان لەسەر شێوەی HTML دادەنرێت چوارەمیشیان وەک تێکستێکی ئاسایی دەبینری بەلام وێنە فایلەکانی تری وێنەیی لەم دوو بەشەی دوایدا دەرناکەون لە کۆتاییدا کلیک لەسەر SAVE بکەو چاوەڕوان بە چەند چرکەیەک پەڕەکە وەک چۆن ویسترا خەزن دەبێت.

وێنەی (١)

وێنەی (٢)

# چۆنێتی بینینی هەموو وێنەکانی ناو ئامێرەکەت

ئا: اسحاق خالند


وێنەی ژمارە-١

وەک دەزانیـن کـە دەتوانـرێ لـە ناو هەمـوو ئامێرێکـی کۆمپیوتـەر چەندین شـتیان لە نـاودا خـەزن بکرێـت و لەو شـتانەی کە لە نـاو کۆمپیوتەرەکانماندا خەزنـی دەکەیـن وێنەیە ئنجـا جارێ وا هەیە کە دەمانەوێ یەکێک لە وێنەکانمان ببینین کە لە ناو ئامێرەکەدا خەزن کراوە ئەوا بـە شـێوەیەکی زۆر ناخـۆش ئەو وێنەیـە دەدۆزینـەوە بە تایبەتـی ئەگەر هاتـوو کۆمپیوتەرەکەمـان وێنـەی زۆر تێـدا بوو ئنجـا بۆ ئاسـان کردنی کاری گـەڕان بـە دوای وێنـە و دۆزینەوەیان دەتوانـن ئـەم هەنگاوانە بنێـن بۆ بینینی هەموو ئـەو وێنانەی کە لـە ناو ئامێری کۆمپیوتەرەکەتان هەیە سـەرەتا بچۆرە سـەر لیسـتی START و ئـەو لیسـتە بە کلیکی لای چەپ بکـەرەوە دواتر بچۆرە سەر هەڵبژاردەی SEARCH ئنجا لەویش یەک جار کلیکی لای چەپ بکە تا بەشـی گـەران SEARCH دەبێتـەوە ئنجا بچۆرە سـەر فەرمانـی FOR FILE OR FOLDER و کلیکـی لای چەپی لەسـەر بکـە دواتر پەنجـەرەی تایبـەت بـە گەڕانـت بـۆ دەکرێتەوە لەو پەنجەرەیەدا بچۆرە سەر فەرمانـی ALL FILES AND FOLDERS و لەسـەر ئەو فەرمانە یـەک جار کلیکی لای چـەپ بکـە بڕوانـە وێنـەی ژمـارە (١) دواتـر دەبینـی کـە دوو بۆشـاییت لەسـەرەوەی پەنجەرەکـە بۆ دروسـت دەبێـت لە بۆشـایی ALL OR PART THE FILE NAME ئـەم نووسـینانە *.*PNG;*.JPG;*.BMP;*.PCX;*.TGA;*.TIF;*.PSD وەکـوو خۆی بنووسـەوە و دواتر کلیک بکە لەسـەر فەرمانی SEARCH ئنجا ئەو فەرمانە هەڵدەسـتێت بە گەڕان بە دوای ئـەو جۆرە وێنانـەی کە لە نـاو ئامێری کۆمپیوتەرەکەدا هەیـە و دەیاندۆزێتەوە ئەگـەر لـە نـاو هـەر جێگایەکـی نـاو کۆمپیوتەرەکەدا بێت هەروەها ئەم کردارە هەموو وێنە شاراوەکانی ناو ئامێرەکەت بۆ ئاشـکرا دەکات و پێت نیشـان دەدات ئنجـا دوای ئەوە دەتوانی ئـەو وێنەیەی کە دەتویسـت کۆپی بکەیت و بیبەیت بۆ ئەو جێگایەی کە خۆت مەبەسـتتە بڕوانە وێنەی ژمارە ( ٢ ) .


وێنەی ژمارە-٢ .




وێنەی (١)

# چۆنیەتی گۆڕینی vcd بۆ dvd


ئا: هێمن هاشم


بـو ئەوەی بتوانین فایلی VCD بگۆڕین
ـو DVD ئەویـش لەڕێـگای بەرنامـەی
WINDVD CREATER ) کە ئەو بەرنامەیە
ـەو کارەمـان بـو دەکات. سـەرەتا
ەکردنـەوەی بەرنامەکـە ڕووبـەری
ەرنامەکەمـان بۆ دیتە سـەر شاشـەکە
جـا ئـەو فایلـەی VCD کـە دەمانەوی
بگورین بو DVD خالی سـییەم هەلبژیرە
کـە (CREATOR CD /DVD)، وەک وینەی (١).

لەپاشـان ئـەو فایلـەی کەدەمانەوێت لەناو هاردەکە یاخود ڕاستەو خۆ لەسەر سیدییەکە دەیکەینەوە وەک وینەی (٢)

لەپاشـان بەرنامەکە دەر دەچیت پیمان نیشـان دەدات کە ئەو فایلە کە بەخۆمان هەلمان بژارد ئینجا دەچینە سەر (MAKE MOVIE) وەک وینەی (٣)

لەپاش ئەم هەنـاگاوە دەبی ئیمە DVD هەلبژیرین کە چ جورە DVD مان مەبەستە لەنـاو هیمایەکەدا دیاری دەکەین و ئینج
هیمای ڕاستە هەلدەبژیرین بروانە وینەی
(٤) لەگەل(٥)

دواتـر ئـەو شـوینە هەلدەبژیریـ
کەدەمانـەوی DVD کـەی لە ناودا خەزن
بکەیـن و کلیک دەکەین لەسـەر فەرمانی
START بروانە وینەی (٦)

پاش کەمیک چاوەڕوان کردن دەبینین
فایلـی VCD گوراوە بـو DVD هەروەکو
لەوینەکەیدا دەیبینین.

بروانە وینەی (٧)

# چۆنیەتی گۆڕینی ناوی (Control Panel) و دانانی لە سەر لیستی (Start)

**وەرگێرانی لە عەرەبییەوە:**
**محمود محمد ساڵەیی**

سەرەتا بچورە سەر لیستی (START) کلیکی لای راستی لە سەر بکەو (EXPLORER) هەڵبژێرە وەک ئەم وێنەی (١).

پاشان ئەم پەنجەرەی (START MENU) ت بۆ دەکرێتەوە دەتوانن کلیکی لای راستی لەسەر بۆشاییەکی پەنجەرەکە بکەن ودواتر(NEW FOLDER) دروست بکەن و ئەم ناوەی لێ بنێن: CONTROLPANEL.{21EC2020-3AEA-1069-A2DD-08002B30309D}

بەلام ئاگاداربە هەڵە مەکە لە ناو لێنانی، چونکە هەر هەڵەیەک دەبێتە هۆی سەرنەگرتنی کارەکەت، وێنەی (٢).

دوای ئەم ناوە لەسەر کیبۆرد دوگمەی (ENTER) دابگرە ئینجا دەبینی جۆری ئایکۆنەکەو ناوەکەی دەگۆڕی وەک وێنەی (٣).

پاشان تۆش کلیکی لای راستی لە سەر بکەو ئەو ناوەی لێ بنێ کە خۆت دەتەوێ وەک وێنەی (٤).

وە لە کوتاییدا پەنجەرەی (START MENU) دابخەو بچۆرە سەرلیستی (START) کلیک بکە دەبینی (CONTROL PANEL) لەسەر لیستی (START)ە و بەو ناوەی کە خۆت لێت ناوە ...




وێنەی ژمارە-١




وێنەی ژمارە-٢




وێنەی ژمارە-٣




وێنەی ژمارە-٤

# درووست کردنی جوانکاری (تأثیرات)

ئا: باوکی توانا

زۆر بەی ئەو کەسانەی لەبواری کومپیوتەردا کاری مۆنتاجی فلیمی سینەمایی دەکەن زۆر پێویستیان بە جوڵانەوەی تەقینەوە و ئاگر دروست کردن و بەفرو باران هەیە . ئەم بەرنامەیە زۆر بەئاسانی ئەم جۆرە شێوازانەمان بۆ دروست دەکات .

سەرەتا بۆ بەکارهێنانی بەرنامەکە لە دوای دامەزراندنی بەرنامەکە لەسەر سیستەمەکە و دوای کردنەوەی بەرنامەکە رووبەری بەرنامەکە دەبینین ئنجا لەلای دەستە راستدا ئەو هێمایانە کەدیاری کراوە ئەمانە هەموو کەرەستەکانن ئەگەر بمانەوێ جوانکاریەک هەڵبژێرین بروانە وێنەی (١).

لەپاشان لەناو شاشەکەدا کلیک دەکەین



وێنەی (١)




وێنەی (٢)




وینەی (٣)

دەبینین جوانکاریەکە دەچێتە سەر شاشەکە ئەگەر چەند جار کلیک بکەین ئەوەندە جارە زیاد دەبێت لە چ شوێنێکی شاشە کلیک بکرێت لەم شوێنە دروست دەبێت بەلێدانی دوگمەی (DELETE) یەک هەنگاو بەرەو دواوە دەگەڕێنەوە، بڕوانە وێنەی (٢).

ئەو هێمایانەی لای دەستە چەپ هەریەکە خاسیەتەکی هەیە وەک رەنگ و چۆنیەتی هاتن و دروست بوون و شێوازی جوانکاریەکە (١) وە ئەگەر بمانەوێ دەست کاری بکەین دەچینە سەر هێلەکانی خوارەوە بەهەر دەسکاری کردنێک جولەیەکمان بۆ دروست دەکات بروانە وینەی (٣).

پاش ئەوەی جۆری جولانەوەکەمان دروست کرد دەچینە سەر دوگمە سورەکە کە (REC ) پێ دەووترێت دادەگریین بروانە وینەی (٤)

دەست نیشانی ئەو شوێنە دەکەین کە بمانەوێ خەزنی بکەین وەلەگەڵ جۆری جولانەوەکە ئیمە لێرەدا پیویستیمان بە فایلی (AVI) هەیە بۆیە بە فایلی(AVI ) هەلی دەگرین وەک وینەی (٥).



وینەی (٤)



وینەی (٥)

# چۆنێتی دامەزراندنی کیبۆردی کوردی لەسەر سیستەمی ویندۆز XP




وینەی (٢)




وینەی (١)




وینەی (٣)

ئا: پاوکی سۆما

لەسەرەتادا دەچینە بواری ئەنتەرنێت و لەسایتی (KURDIUNI\HOWTO.HTM) فایلێک دانراوە بە ناوی کیبۆردی کوردی کەباس لەم سیستەمە دەکات و ئەو فایلە داونلودی واتا دایدەبەزێنینە ناو سیستەمەکە ئنجا دوای دابەزاندنەکە فایلەکە راستەو خۆ دەچێتە ناو (CONTROL PANEL) دەچینە سەر هەرێم وشوێن وزمان واتە (REIGONAL AND OPTIONS) بروانە وینەی (١)

پاشان دەچینەسەر (LANGUAGE) دەیکەینەوە بروانە وینەی (٢)

زمانی (KURDI SORANI BADINI) دەست نیشان دەکەین بروانە وینەی (٣) دەست نیشان کردنی جۆرەکە ئایا لەدەستە راستەوە دەست پێ بکات بەنووسین یان لەچەپەوە

بروانە وینەی (٤)

و دانانی لەلیستی START لەگەل زمانەکانی تر بروانە وینەی (٥)

ئینجا ناساندنی بەکیبۆرد وەک وینەی (٦)

لەکوتاییدا بۆ نووسینی ووشە کوردیەکان لەسەر کیبۆردەکە ئەو کلیلانە بەکار بینە کە لە وینەی ژمارە (٧) ئاماژەی بۆ کراوە .

تیبینی : ئەم سیستەمە تەنها لەسەر ویندوز XP کاردەکات.




وێنەی (٤)




وێنەی (٥)




وێنەی (٦)




وێنەی (٧)



وێنەی (١)

# Deep Freeze

ئا: شەونم اسماعیل

بەرنامەیەکە بەکاردێت بۆ فریزکردنی (بەستنی) هاردیسک یان پارتیشنێک لە هارد دیسک بەکاردێت لەکاتی بەکارهێنانی کۆمپیوتەرێک لە لایەن چەند بەکارهێنەرێکەوە بەمەبەستی تێکنەچوونی سیستەم و پرۆگرامەکانی ناو هاردیسک، ئەم پرۆگرامە زۆر سوود مەندە لە بەکارهێنانی لە قاوەخانەکانی ئنتەرنێت بۆ پاراستنی کۆمپیوتەرەکان لە تێکچوون و سرینەوەی فایلی سیستەمەکان، چونکە دوای فریز کردنی هارد دیسک و چالاک

وێنەی (٢)

کردنی دیپ فریز ئیتر دوای ئەوە هەر گۆڕانکاریەک لە فایلەکان و دانانی هەر بەرنامەیەک کاتی دەبێت، هەر لە دوای دووبارە ئیش کردنەوەی کۆمپیوتەر هیچ لەو گۆڕانکاری و بەرنامە دانراوانە نامێنیت و ئەی گەڕێنیتەوە سەر باری فریزکردنی.

بۆ دانانی ئەم بەرنامە لەسەر کۆمپیوتەرەکەت ئەم هەنگاوانە بگرە بەر:

١-ئەگەر فایلەکانی پرۆگرامەکە لەسەر دیسکی لیزەری بوو یان لە ناو هاردیسک بوو، ئەوا دوو کلیک بکە لەسەر فایلی SETUP.

٢-دوای ئەوە ئەو خانەیەی سەرەوە دێت، وێنە (١) بە پێی ویندۆزەکەت، کلیک بکە لەسەر دوگمەی گونجاو، بۆ نموونە بۆ ویندۆزی XP کلیک بکە لەسەر دوگمەی تەنیشتی.

٣- ئنجا خانەیەک دێتە سەر شاشە، لە ڕێگایە ئەوەوە دەست نیشانی ئەو پارتیشنانە بکە (هەڵیان بژێرە) کە ئەتەوێت فریزیان بکەیت، وێنەی ژمارە (٢).

تێبینی: واباشە تەنها فریزی بەشی C بکەیت، تاکو بتوانیت بەئاسانی سیستەمەکەت بپارێزیت و بتوانیت فایل و دۆکومێنتی نوێ لەسەر بەشی D کۆگە بکەیت، وێنەی ژمارە (٢).

٤-ئنجا کلیک بکە لەسەر دوگمەی NEXT

٥-دوای ئەوە دەست ئەکات بە دانانی بەرنامەکەو، نامەیەک ئەدات کە ئاگادارت ئەکاتەوە کەوا پێویستی بە دووبارە RESTART هەیە بۆ چالاک کردنی بەرنامەکە.

بۆ گۆڕینی باری فریز دوای دانانی بەرنامە:

١-دوگمەی SHIFT دابگرەو لە هەمان کاتدا بە ماوس دووکلیک بکە لەسەر هێمای بەرنامەکە لە گۆشەی خوارەوەی لای ڕاستی TASK BAR، ئنجا خانەیەک دێتە پێش، کلیک بکە لەسەر OK.

٢-بۆ لابردنی فریز BOOT THOWED هەڵبژێرە.

٣-یەک کلیک بکە لەسەر دوگمەی OK.

بۆ چالاک کردنی گۆرانکاریەکان دووبارە کۆمپیوتەرەکەت ئەبێ RESTART بکەیتەوە، وێنەی ژمارە (٣).




وێنەی (٣)

# ئاگاداری

داوا لە هەموو ئەو خوێنەرە بەڕێزانە دەکەین کە هەر پێشنیارێک یان هەر تێبینێک یان هەر ڕەخنەیێکیان هەبوو یان هەر کەم و کوڕێکیان لە گۆڤارەکە بە دی کرد با ئاگادارمان بکاتەوە بەم ناونیشانە : هەرێمی کوردستانی عیراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری لە هەولێر جادەی شەست مەتری نزیک هۆڵی زەرد ژمارە تەلەفونی ٢٢٣٢٧٢١ مۆبایل ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ یان پۆستی ئەلکترۆنی.

EMAIL : COMPUTER_MAGAZINE_2005@YAHOO.COM

EMAIL : ARAS_CO_CENTER@YAHOO.COM

EMAIL : ARAS_AAA@HOTMAIL.COM

# کورتەیەک لە پێکهاتەی گشتی کۆمپیوتەر




ئامادە کردنی: ئەژی عەزیز

**کۆمپیوتەر لە دوو بەشی سەرەکی پێک دیت:**

١-پارچەکانی کۆمپیوتەر HARDWARE

٢-بەرنامەکانی کۆمپیوتەر SOFTWARE

## پارچەکانی کۆمپیوتەر Hardware

مەبەست لە هاردویر پارچە دەزگاکانە کە کۆمپیوتەر پێک دەهێنن،وەکو مەزەربۆرد و پرۆسیسەر وهارد و شاشە و ماوس



وه ئەوانی تر..ئەمانە کاری وەرگرتنی زانیاری و چارەسەرکردنیان (معالجة) و دەرخستنی ئەنجامەکان(OUTPUT) وه خەزنکردنی زانیاریەکان جێ بەجێ دەکات، بۆیە ئەم دەزگایانە دابەش دەکرێن بەپێی ئەو کارەی بەئەنجامی دەگەیەنێت :

- دەزگاکانی وەرگرتن (INPUT) وەکو: کیبۆرد، ماوس، کارتی دەنگ، سکانەر، کامێرا..

- دەزگای کۆنترۆل و چارەسەرکردن (CPU) وەکو : مایکرۆپرۆسیسەر.

- دەزگاکانی (OUTPUT) وەکو: مۆنیتەر،چاپکەر،کارتی دەنگ،دەنگ دروستکەر(سماعة)،وه کارتی شاشە..

- دەزگاکانی (NETWORK) وەکو کارتی نیتورک و مۆدیۆم کە دەتوانێت زانیاری لە کۆمپیوتەرێک بۆ یەکێکی تر ئالوگۆر بکات.

- دەزگاکانی یاد (MEMORY) وەکو: هارد دیسک و رام و رۆم وه فلوپی دسک و سیدیوفلاش میمۆری..

ئەو دەزگایەی کە هەموو پارچەکانی کۆمپیوتەری لەسەری بەستراون و پێکیان دەگەیەنێت،ئەویش دەزگای (MOTHERBOARD)ە،وەبۆتێبینی زۆربەی پارچەکانی کۆمپیوتەر سەربەخۆن،واتە ئەگەر پارچەیەک لەکارکەوت دەتوانین بیگۆرین بەبێ دەستکاری ئەوانی تر.

## بەرنامەکان (Software)

ئەمەش بریتیە لەهەندێ کۆماندو زانیاری،کە بەکارهێنەر بەهۆی بەرنامەی تایبەت (زمانی کۆمپیوتەر) بۆ پارچەکانی کۆمپیوتەر دەنێری واتە ئەمری پێدەکات بۆ جێبەجێ کردنی.

## پەیوەندی نێوان (Hardware) و (Software)

پارچەکانی کۆمپیوتەر ئەوامر لە پرۆگرامەکان وەردەگرن،وە کارەکانیان جێ بەجێ دەکەن، ئەمەش بەگوێرەی بەکارهێنەرو جۆری داواکەی بە شێوەکی گشتی، بەڵام هەربەرنامەیەک تایبەتمەندە بە کارێک لەسەر دەزگایەکی تایبەت لە دەزگاکانی کۆمپیوتەر بۆ نمونە:مۆدیۆم توانای گەیاندنی هێلی تەلەفون بە کۆمپیوتەر هەیە،لێرەدا بەرنامەی تایبەت هەڵدەستی بە دانی ئەمر بۆ مۆدیۆم کە لەگەل ئنتەرنێت پەیوەندی بکات وه بەم شێوەیەش لە دەزگاکانی تر.

لە راستی دا بەرنامە (پرۆگرام )ئەمرێک دەردەکات بۆ سیستەمی ویندۆز نەوەکو بۆ دەزگاکان راستەوخۆ، وه سیستەمی ویندۆز بەهۆی پرۆگرامی تایبەتی خۆی لەرێگەی زمانی کومپیوتەرو ئاسکی کۆد، خۆی و پارچەکانی کومپیوتەر لەیەک دەگەن، بۆ نموونە بەرنامەی ڤیدیۆ لەگەل کارتی شاشە لەم وێنەیە روون کراوەتەوە:



# جوڵاندنی ئاراستەی ماوس بە کیبۆرد




وێنەی ژمارە-١

**ئا: هێرش اسماعیل**

بێگومان هەموو لایەکمان گرنگی کارکردنی ماوس دەزانین لە بەکارهێنانی ئامێری کۆمپیوتەر و زۆر جاری وا هەیە لە کاتێکی زۆر گرنگ و زۆر پێویست ماوسەکەمان ڕادەوستێت لە کار کردن یان تێک دەچێت یان بە هۆی پیس بوونەوە بە جوانی کارەکانمان بۆ ئەنجام نادات ئنجا ئەو کاتەی کە تووشی ئەو جۆرە حاڵەتە دەبین لە ماڵەوە یان لە نووسینگە یان لە کۆمپانیا یان لە فەرمانگە .... هتد،

پێویستە بۆ جێ بە جێ کردنی کارەکانمان بەدیلێک پەیدا بکەین تا بتوانین کارەکانمان تەواو بکەین تا ئەو کاتەی هەلمان بۆ دەرەخسێ کە بچین ماوسەکە بگۆڕین یان چاکی بکەینەوە، بە ئەنجام دانی ئەم چەند هەنگاوە دەتوانین بە هۆی کلیلەکانی کیبۆردەکەوە ئاراستەی ماوسەکە بجوڵێنین . سەرەتا لە لیستی **START** دەچینە سەر هەڵبژاردەی **SETTING** و لەوێشەوە دەچینە سەر بەشی **CONTROL PANEL** بڕوانە وێنەی ژمارە (١) ئنجا لەناو بەشی **CONTROL PANEL** دەچینە سەر بەشی **ACCESSIBILITY OPTIONS** لە سەر ئەو بەشە دوو جار کلیکی لای چەپ دەکەین شێوەیەکمان بۆ دەردەکەوێت لەو شێوەدا دەچینە سەر بەشی **MOUSE** و یەک جار کلیکی لای چەپی لەسەر دەکەین ئەو بەشە دەبێتەوە ئنجا لە ناو






وێنه‌ی ژماره-٢

ئه‌و به‌شه چوار گۆشه‌یه‌کی بچووک ده‌بینین ئه‌و چوار گۆشه‌یه دیاری بکه به هۆی کلیکی لای چه‌په‌وه واتا هێمای √ ڕاست له‌سه‌ر چوار گۆشه‌که دابنێ و دواتر کلیک بکه له‌سه‌ر فه‌رمانی بڕوانه وێنه‌ی ژماره ( ٢ ) ئنجا به هۆی کلیلی ژماره‌کان له‌سه‌ر کیبۆرده‌که ژماره ٨ بۆ سه‌ره‌وه ٤ بۆ لای چه‌پ ٦ بۆ لای ڕاست ٢ بۆ ژێره‌وه ٧ بۆ گۆشه‌ی سه‌ره‌وه‌ی لای چه‌پ ٩ بۆ گۆشه‌ی سه‌ره‌وه‌ی لای ڕاست ١ بۆ گۆشه‌ی خواره‌وه‌ی لای چه‌پ ٣ بۆ گۆشه‌ی خواره‌وه‌ی لای ڕاست هه‌روه‌ها کلیلی ژماره ٥ که له ناوه‌ڕاستی کلیله‌کاندایه بۆ به‌کارهێنانی له جیاتی یه‌ک جار کلیک به‌کاردێت و کلیلی + به‌کار دێت له جیاتی دوو جار کلیکی لای چه‌پ واتا ده‌بل کلیک به هۆی ئه‌و کلیلانه ده‌توانن ئاراسته‌ی ماوسه‌که بجوڵێنن به مه‌رجێک ده‌بێت کلیلی NUM LOCK له‌سه‌ر کیبۆرده‌که پێ بکرێت بڕوانه وێنه‌ی ژماره ( ٣ ) .






وێنه‌ی ژماره-٣

# چۆنیەتی کۆنترۆڵ کردنی کەل وپەلی ناو ماڵ بە کۆمپیوتەر

نبیل عبدالرزاق فتاح
nabil-at@yahoo.com



بـۆ جێ بـە جـێ کردنی ئەم کـردارە پێویسـتیمان بە کیبلی ئامێری چاپ هەیە جـۆری (LPT)، ئـەم کیبلـە سـەرێکی لە کۆمپیوتەر دەبەسـترێت ئـەوەی تری لە ئامێری چاپ،ئەوسـەرەی لە کومپیوتەر دەبەسـترێت پێویسـتمان پێیەتی، لە ٢٥ بزمار پێک هاتووە،

لـە دیـوی نـاوەوەی لـە سـەرڕووی پلاسـتیکەکە ژمارەی بزمـارەکان (PIN) نووسراوە...

بزمـارەکان لـە ژمـارە٢ تاوەکـوو ٩ پێویسـتمان پێیەتی ئـەم بزمارانە پێیان دەگووترێـت بزمارەکانـی داتا، هەروەها بزمارەکانی ژمارە ١٨ تاوەکوو ٢٥ پێیان دەووترێت سارد یان (زەوی-GROUND)، پێویسـتمان بە ٨ بەرگـری هەیە، یەکەی هـەر بەرگریـەک ٤٧٠ ئۆمـە، لەگـەل٨ دایـۆدی ڕووناکـی (LED)، ئـەم دائیـرە کارەبایە بەم شێوەیە دەبەسترێت:-




لەپاش تەواو بوونی دائیرەکە، دەتوانیت ئێسـتا لەگـەڵ کۆمپیوتەر بیبەسـتی بۆ کۆنترۆل کردنی ئەم دائیرەیە پێویستمان بـە پرۆگرامێک هەیە بە زمانی (C++)، بەم شێوەیە:-

بەرنامەکـە بەکار بهێنە (RUN)، ئێسـتا کۆدی هەر بزمارێک لی بدەی ئەم گلۆپە دادەگیرسێت، کۆدەکان بەم شێوەیە:-

| CODE | PIN |
| --- | --- |
| ١ | ٢ |
| ٢ | ٣ |
| ٤ | ٤ |
| ٨ | ٥ |
| ١٦ | ٦ |
| ٣٢ | ٧ |
| ٦٤ | ٨ |
| ١٢٨ | ٩ |

```
#include<iostream.h>
#include<conio.h>
#include<time.h>
#define DATA 0X0378
void wait(float);


void main()
{
int b;
cin >>b;

            _outp(DATA,b);
            wait(0.2);
      }


void wait(float seconds)
{
    clock_t endwait;
    endwait=clock()+seconds
    while(clock()<endwait){
}
```

ئەگـەر حـەز بکـەی هەموویـان دابگیرسێنی ئەوا کۆیان بکەرەوە دەکاتە ٢٥٥. بـۆ زانیاری زیاتـر دەربارەی ئەم کارە پەیوەنـدی بکـە بـە ناونیشـانی نووسەری ئەم بابەتە.